

# سەربڕاوەکان

## لە فیقهـ و شەریعەتی ئیسلامدا

نوسینی : هاوکار کوردی

# پێشەکی

**بسم الله وبه ثقتي**

بابەتی (**الذبائح** : سەربڕاوەکان) بابەتێکی فیقهی و عەقیدەیی هەستیارە کە زۆرێک لە موەحیدان لێی بێ ئاگان وە تووشی خواردنی مردارەوەبوو و کەلاکی تۆپیو بوونە بەهۆی جاهیل بوونیان بە حوکمی سەربڕاوەکانیان ئەگەر بێتوو بە کەسێک بڵێیت ئایە ئەو کەلاکە تۆپیوە دەخۆیت ؟ لە وەڵامدا دەڵێت : ئەوە کەی قسەیە چۆن دەخورێت حەرامە بێ ئاگا لەوەی گۆشتێک دەخوات کە موشریکێک یان مورتەدێک سەری بڕیوە یان بسم الله ـی لەسەر نەکراوە یان بە ڕێگەیەکی شەرعی سەرنەبڕاوە . ئەمڕۆ کوفر و شیرک تەواو بەربڵاوبووە لە جیهان وە دار الإسلامێک نەماوە بێ منەت بە شەعائیرەکەی سەربڕاوەکانیان بخۆیت یان تەنها کێشەی بسم الله کردنت لەسەری هەبێت بەڵکو ئەوەی هەیە ئەمڕۆ دار الکفر ـە بە هەموو جۆرەکانیەوە . ئاڵودەین بۆ سوچێک کە تێیدا قەسابێکی موەحیدی لێبێت بۆ ئەوەی بێ ترس سەربڕاوەکانیان بخۆین . چوونکە لەگەڵ هەبوونی دەیان نواقض لەم خەڵکە بۆیەش شعائیرەکان هیچ ئیعتیبارێکی نەماوە تا لەسەر ئەم ئەسڵە گۆشتەکانیش حەلاڵ بێت . ئەوەی ئەمڕۆ هەیە گشتی دار الکفر ـە بەو پێناسەی سەلەف بۆ دارەکان دەکەن بۆیەش بە مطلق ـی ئەسڵ لە گۆشتەکانیان حەرامێتیە تا ئەوەی دەلیلێک حەلاڵی دەکات . بۆیە تاکی موەحید زۆر گرینگ و پێویستە حیساب بۆ ئەم بابەتە بکات وەک الله تعالى دەفەرموویت :

١ - يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ....... (المائدة آية ٤) أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ أي : أحل لكم من الذبائح

**الطبري دەڵێ** : ئەی محمد صلى الله عليه وسلم هاوەڵانت پرسیاری ئەوەت لێدەکەن کەچی حەلاڵە بۆیان کە بیخۆن ؟ تۆش لە وەڵامدا پێیان بڵێ : ئەوانەتان بۆ حەلاڵە کە الله تعالى ئیزنی خواردنی داوە لە سەربڕاوەکان . تفسير الطبري (٩/ ٥٦٥)

٢ - يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ (المؤمنون آية ٥١)

واتە : ئەی پێغەمبەران بخۆ لەوەی پاکە وە کردەوەی چاک بکەن.

٣ - يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُوا لِلَّهِ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ (البقرة آية ١٧٢)

واتە : ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە بخۆن لەو پاکانەی پێمان بەخشیون.

٤ - أَبِي هُرَيْرَةَ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ اللَّهَ طَيِّبٌ لَا يَقْبَلُ إِلَّا طَيِّبًا، وَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ، فَقَالَ { يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ }، وَقَالَ : { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ}

واتە : ئەبی هورەیرە دەڵێ : پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفرموویێت : ئەی خەڵکینە الله پاکە وە پاکیش نەبێت قەبوڵ ناکات وە الله تعالی فەرمان بە ئیمانداران دەکات وەک چۆن فەرمان بە پێغەمبەران دەکات وە ئەم ئایەتانەی خوێندەوە.. مسند أحمد (٨٣٤٨) سنن الترمذي) ٢٩٨٩ (سنن الدارمي) ٢٧٥٩ (صحيح مسلم (١٠١٥)

کەواتە الله تعالی و پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم فەرمانی پاک خۆریمان لێدەکەن وە نەهی دەکەن لەوەی پیس خۆر و تۆپیو خۆربین . بۆیە ان شاء الله بە کورتی لەم کتێبەماندا باس لە حوکمی سەربڕاوەکان دەکەین لە فیقهـ و شەریعەتی ئیسلامدا بە هیوای ڕەزامەندی الله تعالی.

براتان :

هاوکار کوردی

١ / ١ / ٢٠٢٢

وەڵاتی یۆنان

## (الذكاة لغة وشرعا)

## سەربڕین لە زمانەوانی و پێناسەی شەرعدا

**لە زمانی عەرەبیدا :**

٥ - **التذكية يعني : التطيب** : پاکـ وەکـ عەرەب دەڵێ : رائحة ذكية واتە : بۆنێکی پاکـ فسمي ذبح الحيوان : بۆیەش ناوی لێنراوە سەربڕینی ئاژەڵ لە بەرخواردنی پاکی ـیە . الحاوي الكبير (١٩ / ١٠٣)

**لە پێناسەی شەرعدا:**

٦ - بریتیە لە ڕشتنی خوێن لە لایەن سەربڕێکـ وە ڕژاوی خوێنە لە دەماری سەربڕاوێکـ کە ئاژەڵە .

نيل المآرب (٢ / ٤٠٦)

**لێدوانـم :** (ڕشتنی خوێن) لە پێناو ڕەزامەندی و خۆ نزیک کردنەوە لە الله تعالی.

(لە لایەن سەربڕێکـ) واتە : موەحیدێکـ

(ڕژاوی خوێنە لە دەماری سەربڕاوێکـ) واتە : سەربڕینێکی شەرعی کە بەجوانی و ڕێک و پێکی دەماری ملی پێشەوەی دەبڕیت و خوێنی لێ دەهێنێت.

(کە ئاژەڵە) ئەو ئاژەڵانەی الله تعالی حەڵاڵی کردوون کە دێین ان شاء الله باسی دەکەین .

## (مەشروعیەتی سەربڕین لە قورئان و سووننەت و ئیجماعدا)

**لە قورئاندا:**

٧ - الله تعالى دەفەرمووێت (حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَنْ تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ ...) المائدة أية ٣

واتە : وریابن! خواردنی ئەم شتانە حەرامە:خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو و، هەرخوێنێ لەهەر ئەندامێکی حەیوان بێتە دەرێ و بڕوا، حەرامە بۆتان ئەی موسڵمانان! و هەر ئاژەڵێکیش کە لەوەختی سەربڕیندا ناوی غەیری خوای لێ بهێنرێ و ماڵاتی خنکاوو و لێدراویی مردارەوە بوو و هەڵدێراو و لە شاخ بەرەوە بوو و مردارەوەبوو لەشەڕە قۆچدا و هەرچی دڕندە پەلاماری دابێ و مردارەوە بووبێ مەگەر بەر لەگیان دەرچوونی، فریای چەقۆ کەوتبێ و سەرتان بڕیبێ، واتە: ئەگەر هەریەک لەوانە پێش گیاندەرچوونی بەر دەسکەوت و سەر بڕا، خواردنی حەڵاڵ دەبێ وە هەرچی بۆ بتەکانیش سەربڕا حەرامە و هەرچیش لەسەر قوماری تیر دابەش دەکرێ و، مەبەستەکانی پێ دیاری دەکرێ، قەدەغەو حەرامە. کردنی هەر کارێ لەوانە، لە سنوور دەرچوون و نافەرمانی خوایەو، تۆڵە دەدرێ .

**لە فەرموودەدا:**

٨ - **عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ** : أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم قَالَ : مَا أَنْهَرَ الدَّمَ، وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ، فَكُلُوهُ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ .

**رافع بن خديج** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەرشتێک خوێنی دەڕێژرێت وە ناوی الله ـی لەسەر دەهێنرێت بیخۆن بەڵام نابێی بە ئێسک و نینۆک سەرببڕێن . صحيح البخاري(٢٥٠٧)

**لە ئیجماعدا :**

٩ - **ابن المنذر دەڵێ** : ئیجماع لەسەر ئەوەیە ئەگەر بێتوو ئاژەڵ سەربڕا بەوەی کە درووستە سەرببڕیت لە ئاژەڵان وە ناوی الله ـی لەسەر هێنرا وەدەماری قوڕگی بچڕێندرا و خوێن هاتە خوارەوە ئەوکات ئەو ئاژەڵە خواردنی حەڵاڵە . الإقناع في مسائل الإجماع( ٢٢٣)

سەرەتا دەربارەی (سەربڕاو : **الذبائح**) یەک قاعیدەی بنچینەی شەرعی بزانـە ئەویش بریتیە لە :

(الأصلُ في الذَّبائحِ التَّحريمُ) بنچینە لە سەربڕاو حەڕامکراوە (تا ئەوکاتەی دەلیلێک حەڵاڵی دەکات بە تایبەت لە دار الكفرـدا)

هەڵقوڵاوی ئەو بنچینەش لە فەرموودەیەکی خۆشەویست صلی الله علیه وسلم دەرهێنراوە ئەویش فەرموودەی :

١٠ - **عَدِيٍّ بنِ حاتِمٍ** -رضي الله عنه- دەڵێ : وتم ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من سەگێکم ناردووە بۆ ڕاو وە بسم الله ـم لەسەر کردووە ؟ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتی : ئەگەر سەگەکەت نارد و بسم الله ـت لەسەری کرد ئەگەر ئەم سەگە نێچیرەکەی گرتی و خواردی ئەوە مەیخۆ . چوونکە ئەو سەگە بۆخۆی گرتووە منیش پێم وت : من سەگەکەی خۆم ناردووە بەڵام کاتێ دەچم سەگێکی تری لایە نازانم کامەیان ئەم نێچیرەیان گرتووە پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم پێی وتم : نەیخۆیت چونکە تۆ بسم الله ـت لەسەر سەگی خۆت کردووە نەوەک ئەوی تر . صحيح البخاري (٥٤٨٦)

١١ - وە لە ڕیوایەتی (**مسلم**)ـدا هاتووە : پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتی : ئەگەر گەشتی بە نێچیرەکە بینیت مردووە و هیچی نەخوراوە ئەوە تۆ بیخۆ بەڵام ئەگەر گەشتی بە نێچیرەکە بینیت مردووە و نەخوراوە بەڵام سەگێکی تری لایە ئەوە مەیخۆ چوونکە تۆ نازانیت کامەیان کوشتوویانە . صحيح مسلم( ١٩٢٩ )

**لێدوانم** : ڕووی بەڵگەی ئەم فەرموودانە بریتیە لەوەی گومانت درووست بوو لە سەربڕاوەکە بۆیەش نێچیرەکە لەسەر ئەسڵەکەی مایەوە کە تەحریم ـە بۆیەش ابن القيم لە کتێبی (إعلام الموقعين ٣ / ١٠)ـدا دەڵێ : ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی : فدَلَّ هذا على أنَّ الأصلَ في الذَّبائحِ التَّحريمُ .

١٢ - **ابن العربي** المالكي دەڵێ : زاناکان لەسەلەف دەڵێن : ئەسڵ لە ئاژەڵ حەڕامکردنە گۆشتی حەڵاڵ نیە ئیللا بە سەربڕین (شەرعی) و ڕاوکردنی سەگێکی فێرکراو و بسم الله لەسەرکراو نەبێت . ئەگەر بێتوو گومان لە سەربڕ و ڕاوچی درووست بوو ئەوکات گۆشتەکە لەسەر ئەصڵەکەی خۆی دەمێنێتەوە کە التحریم ـە . أحكام القرآن لابن العربي(2/34-35)

**لێدوانم** : سەیری ڕستەی (ئەگەر بێتوو گومان لە سەربڕ و ڕاوچی درووست بوو ئەوکات گۆشتەکە لەسەر ئەصڵەکەی خۆی دەمێنێتەوە کە التحریم ـە) واتە : ئەگەر گومانت لە عەقیدەی پیاوە سەربڕەکە و فێرکراوە سەگەکە درووست بوو ئەوکات بۆت حەڵاڵ نیە ئەم گۆشتە بخۆیت چوونکە لەسەر ئەصڵەکەی خۆی ماوەتەوە کە حەڕامکراوە .

١٣ - **ابن قدامة الحنبلي** دەڵێ : ئەسڵ لە گۆشت و ئاژەڵ تحریم ـە حەڵاڵ بوونی ئەم گۆشتە وەستاوە لەسەر سەربڕینەکە کە ئایە کێ ئەهلە بۆ ئەم سەربڕینە یان کام سەگ ڕاوی دەکات . المغني(9/375)

**لێدوانم** : کێ ئەهلە ؟ تەبعەن جگە لە کەسێکی موەحید و عەقیدە پاک هیچ کەسێکی تر ئەهل نیە بۆ ئەوەی ئەم تحریم ـە بگۆڕێت بۆ تحلیل .

١٤ - **ابن تیمیة** دەڵێ : گۆشت پێش سەربڕین ئەسڵ تێیدا حەڕامـە وە حلاڵ نیە تا ئەوکاتەی الله تعالی ڕێگەی پێدەدات بە حلاڵ بوونی ئەوەش حوکمێکی ڕوونـە . الفتاوی الکبری (6/229-232)

١٥ - وە دەڵێ : سەربڕاو حەڵاڵ نـیە بە هەبوونی گومان لە سەربڕاوەکە . مجموع الفتاوی[(32/190)

١٦ - **ابن القیم** دەڵێ : باب الذبائح ئەسڵ تێیدا لەسەر تحریم ـە ئیللا ئەو سەربڕاوە نەبێت کە الله تعالی و پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم حەڵاڵیان کردووە ئەگەر بێتوو بەڵگەی (**الحظر** : حەڕامکراو و **الإباحة** : ڕێگەپێدراو) بەگژ یەکداچوونەوە ئەوکات تحریم پێش دەخرێت و کاری پێدەکرێت بەسەر تحلیل لەبەر سێ هۆکار :

١ - پاڵپشتی ئەوکەسەی حەزەر دەکات لەو گۆشتە چوونکە گەر گومان درووست بوو دڵی لەسەر تحریم جێگیر دەبێت .

٢ - ئەوە پارێزراوترە .

٣ - ئەگەر دوو دەلیل بە گژ یەکداچوونەوە ئەوکات پەک دەخرێت و دەگەڕێتەوە سەر ئەسڵەکەی .

أحكام أهل الذمة (1/538) ، 539

١٧ - **ابن رجب الحنبلي** دەڵێ : ئەسڵ لە گۆشتی ئاژەڵ تحريم ـە حەڵاڵ نیە ئیللا بە یەقین نەبێت لە سەربڕاوەکە و سەربڕەکە . بتصرف جامع العلوم والحكم (صـ93)

١٨ - **الشاطبي** دەڵێ : ئاژەڵ ئەسڵ تێیدا ڕێگری کردنە لە خواردنی گۆشتەکەی تا ئەوکاتەی سەربڕینێکی شەرعی حەڵاڵی دەکات . الموافقات(1/401)

١٩ - **الخطابي** دەڵێ : ئاژەڵ ئەسڵ تێیدا تحريم ـە تا ئەوکاتەی دڵنیایی دەبیتەوە لە سەربڕینەکە چوونکە ئەم باسە بە گومان بۆت حڵاڵ نابێت . معالم السنن(4/282)

گومان لە (**باب الذبائح**) بابەتێکی ترسناکە بۆیە هەرکاتێ گومانتان هەبوو دەگەڕێنەوە بۆسەر ئەسڵەکەی کە تحريم ـە ئەوە سەلامەترە بۆ عەقیدەتان چوونکە لەم هەبوونی گومانەش قاعیدەیەکی تر درووست دەبێت ئەویش :

٢٠ - (وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَرَامِ) .

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویت : هەرکەسێک بکەوێتە ناو گومانەوە ئەوە کەوتۆتە ناو حەڕام.

صحيح مسلم( ١٥٩٩)

***

## (سەیربکەن کێ پاکترین و حەڵاڵ ترین خواردنی هەیە)

بابەتێکی تر کە ئێمەی ئیماندار (إن شاء الله) لە کافر و موشریک و تۆپیو خۆر جیا دەکاتەوە بریتیە لە خواردنی پاکترین و حەڵاڵ ترینی خواردنەکان ئەوەش قەواعیدێکی قورئانیە کە الله تعالی بە أصحاب الکهف ـی وت :

٢١ - (فَابْعَثُوا أَحَدَكُمْ بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلْيَنْظُرْ أَيُّهَا أَزْكَى طَعَامًا فَلْيَأْتِكُمْ بِرِزْقٍ مِنْهُ) .

٢٢ - **سعید بن جبیر** دەڵێ : (أَيُّهَا أَزْكَى طَعَامًا) **قال: أحلّ** واتە : کامەیان حەڵاڵ ترین خواردنیان لایە .

تفسير الطبري (١٧ / ٦٣٨)

٢٣ - **الطبري** دەڵێ : (فَلْيَنْظُرْ أَيُّهَا) واتە سەیربکەن کە بزانن کامە کەس خواردنەکەی پاکتر و حەڵاڵتره لە پێناو ئەوەی خۆی جیا بکاتەوە لە قەومەکەی کە بت پەرست بوون چوونکە ئەوان سەربڕاویان حەڕامە و ناخورێت . تفسير الطبري (١٧ / ٦٣٨)

٢٤ - **یحیی بن سلام** دەڵێ : بۆیە الله تعالی فەرمانی پاکترین و حەڵاڵ ترینی خواردنی لەوان کرد چوونکە خواردنی قەومەکەیان حەڵاڵ نەبوون بۆ خواردن . تفسير يحيى بن سلام( ١ / ١٧٥)

٢٥ - **ابن عباس** دەڵێ : (أَزْكَى طَعَامًا) قَالَ: أحل ذَبِيحَة، وكانوا يذبحون للطواغيت واتە : حەڵاڵ ترین سەربڕاو چونکە قەومەکەیان بۆ طاغوتان سەریان دەبڕی . تفسير إبن أبي حاتِم (١٢٧٤٩)

٢٦ - **ابن عباس** دەڵێ : (أَزْكَى طَعَامًا ) يَعْنِي أطهر لأنهم كانوا يذبحون الخنازير واتە : پاکترین لەبەر ئەوەی بەرازیان سەردەبڕی .

**لێدوانم** : بەتایبەت ئەو برایانەی لە وەڵاتانی ئەوروپان دەبێت هۆشیاری ئەم باسە بن و تێیدا حەزەر وەرگری سەربڕین پەیوەندی بە دین و عەقیدەی ئەوکەسەوە هەیە کە ئاژەڵەکە سەر دەبڕێت.

٢٧ - الله تعالى دەفرمووێ : وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ (الأنعام ١٢١)

٢٨ - **قَالَ إبنُ أَبي حَاتِم** حَدَّثَنَا أَبُو سَعِيدٍ الأَشَجُّ ثنا وَكِيعٌ عَنْ سُفْيَانَ عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ عَنْ أَبِي مَالِكٍ فِي الرَّجُلِ يَذْبَحُ وَيَنْسَى أَنْ يُسَمِّيَ، قَالَ: لَا بَأْسَ بِهِ. قُلْتُ: فَأَيْنَ قَوْلُهُ: وَلا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ؟ قَالَ: إِنَّمَا ذَبَحْتَ بِدِينِكَ .

**سلمة بن كهيل** دەڵێ : پرسیار کرا لە أبي مالك دەربارەی پیاوێک حەیوانێکی سەربڕیوە وە لەبیری چووە بسم الله بکات ابی مالک وتی : کێشە نیە وتم : ئەی وتەی الله چی کە دەفەرمووێت (وَلا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ؟) ئیمام وتی : تۆ بەدین و عەقیدەکەت سەری دەبڕیت . تفسير إبن أبي حاتِم (٧٨٣٥)

٢٩ - **مالك** دەڵێ : شێخێک لە بني الأشهل هەواڵی پێدام کە : گەیشتم بە خەڵکانێک ئەو کەسانەیان هەڵدەبژارد بۆ سەربڕاوەکانیان کە خاوەن عەقیدە و دینن . البيان والتحصيل (١٨ / ١٢٤)

٣٠ - قال أبو جعفر: يعني بقوله جل ثناؤه: (وَلا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ) ، لا تأكلوا، أيها المؤمنون، مما مات فلم تذبحوه أنتم، أو يذبحه موحِّدٌ يدين لله بشرائع شَرَعها له في كتاب منزل، فإنه حرام عليكم ولا ما أهلَّ به لغير الله مما ذبَحه المشركون لأوثانهم، فإن أكل ذلك"فسق"، يعني: معصية كفر

**الطبري** دەڵێ : مەیخۆن ئەی ئیمانداران ئەو مرداربووانەی کە ئێوە سەرتان نەبڕیوە یان موەحیدێک کە دینداری بەو شەریعەتە دەکات کە الله تعالى بۆی داناون لە قورئانی دابەزێنراو چوونکە حەڕامە لەسەرتان وە ئەوانەش مەخۆن کە لە غەیری الله تعالى سەربڕدراون لە لایەن موشریکان بۆ بتەکانیان ئەگەر بێتوو بیخۆن ئەوە تاوانێکی کوفرە . تفسير الطبري

## (سەربڕین پەیوەندی بە دین و عەقیدەی ئەوکەسەوە هەیە کە ئاژەڵەکە سەر دەبڕێت)

وە بەڵگەیەکی تر کە قەبوڵ بوونی سەربڕاو پەیوەندی بە دینی ئەو کەسەوە هەیە کە ئاژەڵەکە سەر دەبڕێت ئەم ئەثەرانەن کە لە هاوەڵان و فەقیهەکانی سەلەف ـەوە وارد بووە دەربارەی خاوەنی ئەو سەگەی کە بۆ نێچیرەکە دەینێرێت ئەوانیش :

٣١ - **قەتادە** دەڵێ : پرسیار لە سعید بن المسیب کرا دەربارەی ڕاوکردن بە سەگی پیاوێکی موشریک ؟ ئیمام وتی : زوهری دەڵێ ئەگەر سەگەکە خۆت ڕاوەکەی پێبکەی کێشە نیە . مصنف إبن أبي شيبة (١٩٩٦٥)

٣٢ - **مجاهد** دەڵێ : سەگی پیاوێکی مەجوسی و یەهودی و نەسڕانی ناپەسەندە ڕاوی پێبکەی بەتایبەت سەگی پیاوێکی مەجوسی بەهیچ جۆرێک لە نێچیرەکەی ناخۆیت . مصنف إبن أبي شيبة (١٩٩٦٦)

٣٣ - **حسن البصري** دەڵێ : درووست نیە پیاوێکی موسڵمان پشت بە سەگی مەجوسیەک ببەستێت بۆ ڕاوەکەی وە گۆشتەکەی بخوات بەڵام سەگی یەهودی یان نەسڕانی کێشەی تێیدا نابینم .مصنف إبن أبي شيبة (١٩٩٦٨)

٣٤ - **إبراهيم النخعي** دەڵێ : بۆت درووست نیە ڕاو بە سەگی مەجوسیەک بکەیت. مصنف إبن أبي شيبة (١٩٩٧٠)

٣٥ - **جابر بن عبدالله دەڵێ** : نێچیری سەگی یەهودی و نەسڕانی کێشەی تێدانیە بەڵام خێر لە نێچیری سەگی مەجوسی نیە وە خێر لەسەر براوەکانیشیان نیە نەخێر لە بازیان هەیە نەخێر لە سەگەکەشیان

مصنف إبن أبي شيبة( ١٩٩٧٢)

**لێدوانم** : کەواتە ئەگەر خۆت یان کەسێکی موەحید ئەم ئاژەڵە یان ئەم مریشکە سەرنەبڕێت ئەوە نابێت بیخۆیت چوونکە مەرداره بووە و حەڕامە لەسەرتان وە تەنانەت درووست نیە سەگی پیاوێکی مەجوسی بەکار بێنیت ئەوەش بەهۆی عەقیدەی خاوەنەکەیە نەوەک خودی سەگەکە.

## (ئەو كەسەی ئاژەڵێک سەر دەبڕێت بسم الله لەبیر دەكات)

بسم الله كردن لەسەر سەربڕاوەكان ئیجماعی ئەهلی علم و فیقهـی لەسەرە :

٣٦ - **ابن عباس** دەڵێ : موسڵمان ناوەكەی بەسە وە ئەگەر بێتوو لەكاتی سەربڕیندا بسم الله ـی لەبیرچوو با لای خۆیەوە بسم الله لەسەر گۆشتەكە بكات و بیخوات . سنن الدار قطني (٤٨٠٨)

٣٧ - **ابن عباس** دەڵێ : سەربڕاوی موسڵمان حەڵاڵە بسم الله ـی لەسەركردبێت یاخود نەیكردبێت . المراسيل لأبي داود( ٣٧٨)

٣٨ - **مِينَاء** دەڵێ : **حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ** مەڕێكی دابەستراوی ماڵی هەبوو ڕۆژێک بینی لەسەر جێگاكەی میزی كردووە ئەویش لە توڕەیا هێرشی بۆ برد و سەری بڕی و بسم الله ـی لەسەر نەكرد مِينَا وتی : حُمَيْدِ پێی وتم : ئەی مینا هەستە بڕۆ بۆلای أَبِي هُرَيْرَةَ پێی بڵێ : كوڕی براكەت سەلامت لێدەكات وە من هێرشم كردۆتە سەر مەڕێک لە توڕەیا گرتوومە و سەرم بڕیوە و بسم الله ـم لەسەری نەكردووە مینا دەڵێ : منیش هەڵسام چووم بۆلای و شتەكەم بۆی باس كرد ئەویش پێی وتم : هیچ كێشەیەكی نیەت بۆت ئەگەر بیخۆیت . الآمالي في آثار الصحابة لعبدالرزاق(٧١)

٣٩ - **ابن عباس** دەڵێ : موسڵمان ناوێكە لە ناوەكانی الله تعالى ئەگەر هەر یەكێک لە ئێوە بسم الله ـی لەبیركرد لەسەر سەربڕاوی ئەوە بسم الله بكەن و بیخۆن . سنن سعيد بن منصور (٩١٤)

٤٠ - **ابن عباس** دەڵێ : لە موسڵماندا ناوی الله تعالى هەیە ئەگەر بێتوو سەری ئاژەڵێک ببڕێت وەئەگەر لەبیرت چوو بسم الله بكەیت ئەوە بیخۆ بەڵام ئەگەر بێتوو مەجوسیەک سەری ببڕیت و بسم الله بكات ئەوە ناخورێت . مصنف عبدالرزاق (٨٥٤٨)

٤١ - پرسیار لە **إبراهيم النخعي** کرا دەربارەی پیاوێک کە ئاژەڵێکی سەربڕیوە و بسم الله ـی لەبیرکردووە ؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ : کێشەی نیە بەڵام ناپەسەندیشە بەڵام ناڵێم حەڕامە . تفسير سعيد بن منصور( ٩١٢)

٤٢ - **أبي السوَّار** دەڵێ : پرسیارم لە أبا رافع کرد دەربارەی پیاوێک کە ئاژەڵێکی سەربڕیوە و بسم الله بیرچووە ؟ أبا رافع وتی : بیخۆن . جزء لابن مخلد العطار( ١٧)

٤٣ - **الحكم** دەڵێ : پرسیارم لە عبدالرحمن بن أبي ليلي کرد دەربارەی سەربڕاوی موسڵمانێک کە لەبیری چووە بسم الله بکات ؟ ئیمام وتی : گۆشتەکە دەخورێت چوونکە لەسەر دین و میللەتەکەی سەربڕدراوە ئایە نەت بینیوە کابرایەکی مەجوسی ئەگەر بێتوو بسم الله ـش لەسەر سەربڕاوەکە بکە هەر مردارەوە بووە و ناخورێت . تفسير عبدالرزاق (٨٥٤٥)

**لێدوانم** : ئەوەش بەڵگەیەکی ترە کە قەبوڵ بوونی سەربڕاو پەیوەندی بە دین و عەقیدەی ئەو کەسەوەیە کە ئاژەڵەکە سەر دەبڕێت

٤٤ - **ئیمامی شافعی** دەڵێ : ئەگەر بێتوو بسم الله نەکرا بەهۆی لەبیرچوونەوە وە ئاژەڵەکەی سەربڕی ئەوە دەخورێت چوونکە موسڵمان بەردەوام ئاژەڵ لەسەر ناوی الله سەر دەبڕێت ئەگەر لەبیریشی بچێت.

سنن الصغير للبيهقي( ١٨٧٨٩)

٤٥ - **عبدالله بن الإمام أحمد** دەڵێ : محمد بن سيرين دەربارەی پیاوێک کە ئاژەڵێک سەر دەبڕێت و لەبیر دەکات بسم الله بکات بە درووستی نەزانیوە و ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە (وَلا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ) ئەم ئەثەرەم بۆ باوکم گێڕاوە ئەو وتی : خواردنی کێشەی تێدا نیە ئەگەر بسم الله ـش نەکات . مسائل الإمام أحمد رواية عبدالله(٩٧٤)

٤٦ - **اسحاق** دەڵێ : پرسیارم لە ئیمام ئەحمەد کرد دەربارەی ئەو کەسەی بسم الله لەبیر دەکات لەکاتی سەربڕیندا ؟ ئیمام وتی : کێشەی تێدا نیە . مسائل الكوسج( ١٥٢٧)

## (ئەو کەسەی بە ئەنقەست بسم الله ناکات گۆشتەکەی ناخورێت)

٤٧ - **عبدالله** دەڵێ : پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی ئەو کەسەی بسم الله لەبیر دەکات یان بە ئەنقەست نایکات لەکاتی سەربڕیندا ؟ باوکم وتی : ئەگەر لەبیری کرد کێشە نیە دەخورێت بەڵام ئەگەر بە ئەنقەست نەیکرد ئەوە ناخورێت . مسائل الإمام أحمد رواية عبدالله(٩٧٤)

٤٨ - **اسحاق** دەڵێ : پرسیار لە سفیان بن عیینة کرا دەربارەی پیاوێک کە بسم الله بە ئەنقەست ناکات ؟ ئیمام وتی : وای نابینم خواردنی درووست بێت .

٤٩ - **اسحاق** دەڵێ : ئەوەی بە ئەنقەست بسم الله نەکات ئەسڵەن گۆشتەکە ناخورێت . مسائل الكوسج( ٢٨٧٩)

٥٠ - **حسن البصري** دەڵێ : هەرکەسێک بسم الله لەبیربکات ئەوە گۆشتەکە دەخورێت بەڵام ئەوەی بە ئەنقەست بسم الله نەکات ئەوە گۆشتەکە ناخورێت . التمهيد لابن عبدالبر (٢٢ / ٣٠٢)



## (سەربڕاوی مجهول الحال )

**مجهول الحال** : بریتیە لەو کەسەی کە هیچ کوفرێکـ و شیعارێکی ئیسلامی لێ نەبینراوە حاڵی بەهیچ لایەکـ بەدیار نەکەوتووە .

٥١ - **ابن قدامة** دەڵێ : لأنَّ الأصْلَ أنَّ مَن كان في دَارٍ، فهو من أهْلِها، يَثْبُتُ له حُكْمُهم ما لم يَقُمْ على خِلافِه دَلِيلٌ .

ئەسڵ ئەوەیە لەهەر دارێکـ بیت ئەوە لەو ئەهلەیە حوکمی دارەکەی لەسەر جێگیر دەبێت مادەم دەلیلێکـ پێچەوانەی هەڵنەستاوە . المغني (٣ / ٤٧٨)

**مجهول الحال** لە **دار الکفر** ـدا جا **دار الكفر الأصلي** بێت یاخود **دار الردة** یان **دارالحرب** بێت حوکمی دارەکەی هەیە تا ئەوکاتەی خۆی بەلایەکـ یەکلا دەکاتەوە یان ئەوەتە شعائیری ئیسلام بەدیار دەخات دێتە ناو بازنەی **إسلام الحكمي** ئەوکات حوکم بە شەعائیری دەدەین یان ئەوەتە لایەنی کوفری بەدیار دەخات و تەکفیری دەکەین تابع بە دارەکەی بەڵام ئەگەر بێتوو هیچی بەدیار نەخست ئەوکات تەکفیری دەکرێت بەهۆی ئەوەی (يَثْبُتُ له حُكْمُهم) حوکمی دارەکەی کە کوفرە تەکفیر دەکرێت مادەم (لم يَقُمْ على خِلافِه دَلِيلٌ) دەلیلێکـ پێچەوانەی ئەو تەکفیرەمان نیە کە ببێتە مانع لە تەکفیرکردنی ئەویش شعائیرە . بۆیە لە ڕووی سەربڕاوی کەسی **مجهول الحال** دەوستیت وە دەگەڕێیتەوە سەر ئەسڵەکەی کە التحریم ـە تا ئەم کەسە جەهالەتی حاڵی نامێنێت یان ئەوەیە شەعائیر بەدیار دەخات بەبێ هیچ ناقضێکـ ئەوکات لەسەر زاهیرەکەی سەربڕاوی حەڵاڵە یان ئەوەیە کوفر بەدیار دەخات ئەوکات بە ڕەهایی سەربڕاوی حەرامە . بۆیە سەربڕاوی **مجهول الحال** تێیدا دەوستیت وە دەگەڕێیتەوە بۆ ئەسڵەکەی کە **التحريم** ـە تا ئەوکاتەی حاڵی دەزانرێت لەوەش هەندێکـ بەڵگە هەن ئەوانیش :

٥٢ - **عَدِيِّ بنِ حاتِمٍ** -رضي الله عنه- دەڵێ : وتم ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم من سەگێکم ناردووە بۆ ڕاو وە بسم الله ـم لەسەر کردووە ؟ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وتی : ئەگەر سەگەکەت نارد و بسم الله ـت لەسەری کرد ئەگەر ئەم سەگە نێچیرەکەی گرتی و خواردی ئەوە مەیخۆ . چوونکە ئەو سەگە بۆخۆی گرتووە منیش پێم وت : من سەگەکەی خۆم ناردووە بەڵام کاتێ دەچم سەگێکی تری لایە نازانم کامەیان ئەم نێچیرەیان گرتووە پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم پێی وتم : نەیخۆیت چونکە تۆ بسم الله ـت لەسەر سەگی خۆت کردووە نەوەکـ ئەوی تر. صحيح البخاري (٥٤٨٦)

٥٣ - وە لە ڕیوایەتی (**مسلم**)ـدا هاتووە : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وتی : ئەگەر گەشتی بە نێچیرەکە بینیت مردووە و هیچی نەخوراوە ئەوە تۆ بیخۆ بەڵام ئەگەر گەشتی بە نێچیرەکە بینیت مردووە و نەخوراوە بەڵام سەگێکی تری لایە ئەوە مەیخۆ چوونکە تۆ نازانیت کامەیان کوشتوویانە . صحيح مسلم (١٩٢٩)

٥٤ - **ابن مسعود** دەڵێ:  ئەگەر تیرت گرت لە باڵندەیەکـ کەوتە ناو ئاوێکە مەیخۆ چونکە ئەترسێم  ئاوەکە کوشتبێتی وە ئەگەر تیرت لە نێچیرێک گرت و کەوتە سەر شاخێکەوە مەیخۆ چونکە ئەترسێم بەهۆی کەوتنەکەوە مردبێت . مصنف إبن أبي شيبة (١٩٦٩١)

٥٥ - پیاوێکـ پرسیار لە **سعید بن جبیر** کرد وتی : من تیرم لە نێچیرێکـ گرت دواتر نێچیرەکەم لێ ون بوو لەپاشاندا دۆزیمەوە سعید پێی وت : ئەگەر دۆزیتەوە جگە کە نیشانەی ڕمەکەت هیچی تری لەسەر نەبوو ئەوە بیخۆ بەڵام ئەگەر شتی ترت بینی مەیخۆ . مصنف إبن أبي شيبة (١٩٦٨٨)

٥٦ - **ابن مسعود** دەڵێ:  ئەگەر لە نێوان فارس و نبط دابەزین ئەگەر گۆشتان کڕی پرسیار بکەن ئەگەر بێتوو سەربڕاوی یەهودی و گاورەکان بوو ئەوە بیخۆن وە ئەگەر سەر بڕاوی مەجوسی بوو مەیخۆن

مصنف إبن أبي شيبة (٣٢٦٩٣)

لێدوانـم : لەم بەڵگانە ئەوە دەردەخات کە ئەگەر بێتوو چوون بۆ وڵاتی کوفر ئەگەر گۆشتان کڕی پرسیار بکەن کە کێ سەری بڕیوە گەرنەتانزانی ئەوە تێیدا بوەستن مەیخۆن وە بیگەڕێینەوە بۆسەر ئەسڵەکەی کە التحريم ـە وە بەتایبەت لە دار و وەڵاتێکـ کە تێیدا شیرک و بیدەع تێیدا بڵاوە .

٥٧ - **ئیمامی نەسائی** لە "**سنن**"ـەکەیدا باب ـێکی داناوە بە ناوی : ذَبِيحَةُ مَنْ لَمْ يُعْرَفْ

ڕاڤەی ئەم باب ـە بریتیە لە : وشەی (يُعْرِفْ) بناء المفعول ـە واتە : کەسێکـ ئاژەڵێکـ سەر دەبڕێت نازانرێت ئایە سەربڕاوەکەی حڵاڵە یاخود نا بەهۆی نەوتنی بسم الله لەسەری ؟ نەوەکـ مەبەستی سەربڕاوی مجهول الحال بێت بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە مەبەست لە سەربڕاوی مجهول الحال نیە ئیمامی النسائي هەر لە "**سنن**"ـدا **كِتَابُ الضَّحَايَا** لە **ذَبِيحَةُ مَنْ لَمْ يَعْرِفْ** ـدا ئەم فەرموودەیە دەهێنێت :

٥٨ - **أَخْبَرَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ** ، قَالَ : حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ ، قَالَ : حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ نَاسًا مِنَ الْأَعْرَابِ كَانُوا يَأْتُونَا بِلَحْمٍ، وَلَا نَدْرِي أَذَكَرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : اذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَلَيْهِ وَكُلُوا .

**عائیشە** دەڵێ : خەڵکانێکـ لە دەشتەکیەکان گۆشتمان بۆ دەهێنن نازانین ئایە بسم الله ـیان لەسەر کردووە یاخود نا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی : ناوێ خوای لەسەر بێنن و بیخۆن.

٥٩ - **زکریا الأنصاري** دەڵێ : ولا يصح شراء لحم مجهول الذكاة الشرعية بقرية يسكنها مجوس؛ لأن الأصل في الحيوان التحريم، فلا يزال إلا بيقين أو ظاهر، فإن كان غالب أهل البلد مسلمين صح شراؤه، فإنه يجوز أكله عملاً بالغالب والظاهر .

درووست نیە کڕینی گۆشت لەکەسێکی مجهول لە شارێک کە مەجوس تێیدا دادەنیشێت لەبەرئەوەی ئەسڵ لە ئاژەڵدا گۆشتەکەی حەڕامە بەردەوام تا ئەوکاتەی بە یەقین یان بە شەعائیر موسڵمانێتی لێ دیوە ئەگەر بێتوو زۆرینەی خەڵکی ئەم شارە موسڵمان بن ئەوکات کڕینی درووستە وە درووستە خواردنی بە کردەوە کردن بە زۆرینە و شەعائیر . أسنى المطالب (٢/ ٤١)

**لێدوانم** : چەند سوودێکـی تێدایە :

١ - (**بقرية يسكنها مجوس**)لە دار الكفر ـدا (نمونەی وڵاتی ئێران و عێراق )درووست نیە گۆشت لە قەسابخانە یاخو دوکانی کەسێکی مەجهول الحال ـی مریشک فرۆش و گۆشت فرۆش بکڕیت چونکە مجهول الحال حوکمی دارە ـەکەی هەیە تا حاڵی ئاشکرا دەبێت وە ئەسڵ لەگۆشتەکەدا التحريم ـە .

٢- (**فلا يزال إلا بيقين أو ظاهر**) واتە تا ئەوکاتەی یەقینت بۆ درووست دەبێت کە ئەو کەسە موەحیدە یاخود بە زاهیری شەعائیری بەومەرجەی هیچ ناقضێکی نەبێت.

٣ - (**فإن كان غالب أهل البلد مسلمين صح شراؤه**) لەدار إسلام ـدا ئەوکات کڕینی گۆشت لەکەسی مجهول درووستە وە خواردنی درووستە.

**چەند پرسێکـ :**

١ - لە هەر دار الكفر ـێک ئەگەر قەصابخانە یان لە مارکێتەکان گۆشتی ناو قوتی یان پاکێج یان لایلۆن هەبوو ئەگەرچی لەسەریشی نووسرابوو **حلال على الشريعة الإسلام**) ئەوە بۆت حڵاڵ نیە بیخۆیت وە تێیدا دەوستیت تا ئەو کاتەی ئەو کەسانە دەناسیت کە سەر دەبڕێت . ئەو حوکمە کوردستانی خۆمانیش دەگرێتەوە چوونکە دار الكفر ـە تێیدا دەوستیت تا ئەوکاتەی بۆت ڕوون دەبێتەوە .

٢ - گۆشتێکت بۆ دێت بەخێر لە جەژنی قوربان یان هەر بۆنیەکی تر تێیدا لە خواردنی دەوستیت بە تایبەت لە دار الكفر ـدا ئەگەر ئەوکەسانەی بۆیان هێنایت **مستور الحال** بوون ئەوە حەڵاڵە بیخۆیت وەک فەرموودەکەی دایە عائیشە وە ئەگەر **مجهول الحال** بێت ئەوە تێیدا دەوستیت وە دەگەڕێیتەوە سەر ئەسڵەکەی کە **التحريم** ـە ئەگەر ئی یەهود و نەساڕا بێت حڵاڵە بۆت بیخۆیت بەو مەرجەی ناوی مەسیحیان لەسەر نەهێنابێت یان ناوی غەیری الله ـیان لەسەر نەهێنابێت . مەجوس و شیعە و ئەشعەری و جەهمی گۆڕ پەرست و قەدەری بوو سەربڕاویان حەڵاڵ نیە . عەلمانی و شیوعی و مارکسی و لینین و یەکێتی و پارتی و گۆڕان و نەوەی نوێ و کۆمەڵ و یەکگرتوو و بزوتنەوە و مەدخلیە طاغوت پەرستەکان سەربڕاویان درووست نیە .

دوای لە بابەتی مجهول الحال دەردەچین دەچین بۆ بابەتێکی تر ئەویش مستور الحال ـە

## (سەربڕاوی مستور الحال )

**مستور الحال** بریتیە : لەو كەسەی كە شعائیری ئیسلامان لێ بینیوە لەبەرامبەریدا هیچ ناقضێک لە نەواقیضـەكانی ئیسلامی لێ نەبینراوە تا شعائیرەكانی هەڵبوەشێنێتەوە .

سەربڕاوی مستور الحال لە دار الإسلام یان دار الكفر بێت دەخورێت لە دار الكفر بەهۆی ئەنجامدانی شەعائیری ئیسلامەكەی و نەبوونـی هیچ نەواقیضێک سەربڕاوی بۆ ئێمە حەڵاڵە بەهۆی شعائیر بەو مەرجەی بسم الله بكات لەسەر سەربڕاوەكە وە ئەگەر لەبیری چوو كێشەی تێدانیە و دەخورێت بەڵام ئەگەر بە ئەنقەست نەیكات ئەوە سەربڕاوەكەی ناخورێت وە ئەسڵ لە سەربڕاوی مستور الحال حەلاڵە بەڵگەكانیش :

٦٠ - عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ قَوْمًا قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ قَوْمًا يَأْتُونَنَا بِاللَّحْمِ لَا نَدْرِي أَذَكَرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " سَمُّوا اللَّهَ عَلَيْهِ وَكُلُوهُ . صحيح البخاري (٢٠٥٧)

٦١ - عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ قَوْمًا قَالُوا لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : إِنَّ قَوْمًا يَأْتُونَا بِاللَّحْمِ، لَا نَدْرِي أَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لَا. فَقَالَ : " سَمُّوا عَلَيْهِ أَنْتُمْ، وَكُلُوهُ ". قَالَتْ : وَكَانُوا حَدِيثِي عَهْدٍ بِالْكُفْرِ.

صحيح البخاري (٥٥٠٧)

٦٢ - عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنَّ قَوْمًا قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، إِنَّ قَوْمًا يَأْتُونَا بِاللَّحْمِ، لَا نَدْرِي أَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لَا ؟ فَقَالَ : سَمُّوا أَنْتُمْ وَكُلُوا . وَكَانُوا حَدِيثَ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ.سنن ابن ماجه (٣١٧٤)

**ڕاڤەی ئەم فەرموودانـە :**

(إِنَّ قَوْمًا) ئاماژەیە بۆ مستور الحال كە دایە عائیشە تەنها شعائیریان لەو دەشتەكیانە بینیوە و هیچ ناقیضێكیان لێ نەبینیوە

(يَأْتُونَا بِاللَّحْمِ) ئاماژەیە بۆ سەربڕاوەکانیان

(لَا نَدْرِي أَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لَا ؟) ئەوەش هۆکاری گومانی دایە عائیشە بوو لە حلاڵی و حەڕامی سەربڕاوەکە نەوەک حاڵی کەسەکە چونکە حاڵی کەسە دەشتەکیەکە بریتیە لە دیارخەری شەعائیری ئیسلامەکەی .

(سَمُّوا أَنْتُمْ وَكُلُوا) لێرەش پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم حوكمی بە زاهیری ئیسلامەتیەکەی اعراب ـی داوە بۆیە فەرمووی : لە دینی سەربڕەکە دڵنیابن وە بە نیسبەت گۆشتی سەربڕاوەکە ئێوە خۆتان بسم الله ـی لەسەر بکەن و بیخۆن .

(وَكَانُوا حَدِيثَ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ . وَكَانُوا حَدِيثِي عَهْدٍ بِالْكُفْرِ) ئەوەش شایەتی دایە عائیشەیە لەسەر ئیسلامەتی ئەو دەشتەکیانە.

٦٣ - **عروة** دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم کەسانێک تازە موسڵمان بوون وە هاتن بۆ مەدینە گۆشتیان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنا لە بازاڕی مەدینە دەیان فرۆشت کێشە کەوتە نێوان هاوەڵان لەوەی کە ئەم گۆشتانە بسم الله ـیان لەسەر کراوە یان نەکراوە بۆیە چوون بە پێغەمبەریان وت صلى الله عليه وسلم ئەویش پێی فەرموون : **بسم الله** بکەن و بیخۆن . تفسير عبدالرزاق (٨٥٤٢)

٦٤ - **علي الأزدي** دەڵێ: پرسیارم لە ابن عمر کرد : ئێمە سەفەر دەکەین بۆ کۆمەڵێک زەوی مناڵ و اعرابی گۆشتمان پێ دەدەن ئێمە نازانین ئەم گۆشتە چیە و چۆنە ؟ ابن عمر وتی : موسڵمان نانت پێ ئەدات .

تفسير عبدالرزاق (٨٥٥٧)

٦٥ - پرسیارکرا لە **ئیمام عەلی** دەربارەی خواردنی پەنیر ؟ ئیمام وتی : ئەگەر نەتزانی کێ ئەم پەنیرە لە شیر درووست ئەکات ئەوە بسم الله بکە و بیخۆ . مصنف إبن أبي شيبة (٢٤٤٢١)

❋❋❋

**(سەربڕاوی موسڵمانێکی ڕاست و درووست)**

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویت :

٦٦ - **عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ** ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : مَنْ صَلَّى صَلاَتَنَا، وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا، وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا، فَذَلِكَ الْمُسْلِمُ الَّذِي لَهُ ذِمَّةُ اللَّهِ، وَذِمَّةُ رَسُولِهِ، فَلاَ تُخْفِرُوا اللَّهَ فِي ذِمَّتِهِ. صحيح البخاري (٣٩١) سنن النسائي (٤٩٩٧)

٦٧ - **عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ** ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوهَا وَصَلَّوْا صَلاَتَنَا، وَاسْتَقْبَلُوا قِبْلَتَنَا، وَذَبَحُوا ذَبِيحَتَنَا، فَقَدْ حَرُمَتْ عَلَيْنَا دِمَاؤُهُمْ، وَأَمْوَالُهُمْ إِلَّا بِحَقِّهَا، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ . صحيح البخاري (٣٩٢)

٦٨ - **عَنْ أَنَسٍ قَالَ** : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنْ يَسْتَقْبِلُوا قِبْلَتَنَا، وَأَنْ يَأْكُلُوا ذَبِيحَتَنَا، وَأَنْ يُصَلُّوا صَلَاتَنَا، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ حَرُمَتْ عَلَيْنَا دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ إِلَّا بِحَقِّهَا ؛ لَهُمْ مَا لِلْمُسْلِمِينَ، وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُسْلِمِينَ. سنن أبي داود (٢٦٤١)

٦٩ - **عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ** : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنْ يَسْتَقْبِلُوا قِبْلَتَنَا، وَيَأْكُلُوا ذَبِيحَتَنَا، وَأَنْ يُصَلُّوا صَلَاتَنَا، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ حَرُمَتْ عَلَيْنَا دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ إِلَّا بِحَقِّهَا، لَهُمْ مَا لِلْمُسْلِمِينَ، وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُسْلِمِينَ. سنن الترمذي (٢٦٠٨)

٧٠ - **عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ** ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : " أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، فَإِذَا شَهِدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَاسْتَقْبَلُوا قِبْلَتَنَا، وَأَكَلُوا ذَبِيحَتَنَا، وَصَلَّوْا صَلَاتَنَا فَقَدْ حَرُمَتْ عَلَيْنَا دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ إِلَّا بِحَقِّهَا، لَهُمْ مَا لِلْمُسْلِمِينَ، وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَيْهِمْ . سنن النسائي (٣٩٦٧) مسند احمد (١٣٠٥٦)

٧١ - **حدثنا وكيع قال:** ثنا يزيد بن إبراهيم عن الحسن قال: كتب رسول اللَّه -صلى اللَّه عليه وسلم- إلى أهل اليمن: "من صلى صلاتنا واستقبل قبلتنا وأكل ذبيحتنا فذالكم المسلم، له ذمة اللَّه وذمة (رسوله) ( - صلى اللَّه عليه وسلم- ومن أبى فعليه الجزية" . مصنف إبن أبي شيبة (٣٤٨٢٠)

**ڕاڤەکردن** : وشەکانی (وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا . وَذَبَحُوا ذَبِيحَتَنَا . وَأَكَلُوا ذَبِيحَتَنَا) بەڵگەی درووستن لەسەر ئەوەی کە ئەسڵ لە سەربڕاوی موسڵمان حەڵاڵە تا ئەوکاتەی ناقضێک حەرامی دەکات لە دار الکفر بێت یاخود دار الإسلام تەبعەن باس لەو موسڵمانە دەکەین پابەندە بە گشت شعائیرەکانی ئیسلام.

٧٢ - **إبن رجب الحنبلي** دەڵێ : سەربڕاوی موسڵمانان (وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا) ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو کەسەی سەربڕاوی ئێمە دەخوات پابەندی تەواوی هەبێت بە گشت درووشمەکانی ئیسلام لە گەورەترینیان خواردنی سەربڕاوی موسڵمانان وە یەک دەنگ بێت لەگەڵ سەربڕاویان هەرکەسێ ڕێگری ئەوە بکات ئەوە موسڵمان نیە چوونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەندێک جار امتیحانی ئەو کەسانەی دەکرد کە داخلی ئیسلام دەبوون بە سەربڕاوی موسڵمانان چوونکە لە دینی یەکەمیان کە تێیدا بوون ڕێگریان دەکرد لەوەی سەربڕاوی موسڵمانان بخۆن بۆیە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەو امتیحانە ئیسلامەتی ڕاستەقینەی ئەوانی بۆ بەدیار دەکەوت . فتح الباري لابن رجب (٣ / ٥٧)

***

## (سەربڕاوی ئافرەت)

٧٣ - **عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ** دەڵێ : كعب بن مالك جاریەكەی هەبوو مەڕەكانی لە سلع (چیایەكی بەناوبانگە لە شاری مەدینە) دەلەوەڕاند مەڕێكی لێ مرد ئەویش بەردێكی تیژی هێنا و سەری بڕی پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرمانی كرد بە خواردنی . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٦٠)

٧٤ - **ابْنَ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ** دەڵێ : ابن عمر هەواڵی پێداین كە باوكم جاریەكی هەبوو مەڕەكانی لە سلع (چیایەكی بەناوبانگە لە شاری مەدینە) دەلەوەڕاند بینی مەڕێك لە مێگەلەكە مردووە بەردێكی شكاند و هێنای سەری بڕی بە خێزانەكەم وت : مەیخۆن تا پێغەمبەر دێت صلی الله علیه وسلم یاخود یان كەسێك دەنێرم تا پرسیاری لێدەكات پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرمانی كرد بە خواردنی . صحيح البخاري (٥٥٠١)

**لێدوانـم** : بەم بەڵگانە ئافرەت درووستە ئاژەڵ سەرببڕێت وە سەربڕاوی دەخورێت مادەم توانای سەربڕینی هەبێت

٧٥ - **إسحاق بن منصور** دەڵێ : پرسیارم لە ئیمام احمد كرد دەربارەی سەربڕاوی ئافرەت و منداڵ ؟ ئیمام وتی : كێشەی تێدانیە ئەگەر بێتوو منداڵ توانای سەربڕینی هەبێت . مسائل الكوسج (١٥٢٥)

٧٦ - **ابن هانئ** دەڵێ : گوێم لە ئیمام احمد بوو دەی وت : كێشە نیە لە سەربڕاوی منداڵ و ئافرەت ئەگەر لەتوانایاندا بێت . مسائل ابن هانئ (١٧٣٤)

٧٧ - **عبدالله بن الإمام أحمد** دەڵێ : پرسیارم لە باوكم كرد دەربارەی سەربڕاوی دەستی منداڵ و ئافرەت ؟ باوكم وتی : ئەگەر توانای سەربڕینیان هەبێت كێشە نیە وە ڕیوایەتی كرد كە جاریەكەی كعب بن مالك لە مەڕوە ئاژەڵێكی سەر بڕی پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرمانی كرد بە خواردنی . مسائل عبد اللَّه (٩٨٨)

٧٨ - **أبي بردة** دەڵێ : باوکی موسا فەرمانی بە کچەکانی دەکرد کە بەدەستی خۆیان قوربانیەکان سەربڕن .

مسائل عبد اللَّه (٩٨٩)

٧٩ - **ابن قدامة** دەڵێ : هەرکەسێک توانای سەربڕینی هەبێت لە موسڵمانان و اهل الكتاب جا ژن بێت یان پیاو ئەوە سەربراوی دەستی حەڵاڵە . المغني( ١٣/ ٣١١)

٨٠ - ابن قدامة لە ڕاڤەی فەرموودەکەی بوخاری و عبدالرزاق دەڵێ :

**ئەم فەرموودەیە چەند سوودێکی تێدایە :**

١ - حەڵاڵیەتی سەربڕاوی دەستی ئافرەت.

٢ - حەڵاڵیەتی سەربڕاوی دەستی جاریە.

٣ - حەڵاڵیەتی سەربڕاوی دەستی ئافرەتێکی حەیزدار چونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم جیای نەکردۆتەوە.

٤ - حەڵاڵیەتی سەربڕین بە بەرد .

٥ - حەڵاڵیەتی سەر بڕینی ئەو ئاژەڵەی کە ترسی مردنی هەیە.

٦ - حەڵاڵ بوونی سەربڕینی مەڕەکە بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی . المغني( ١٣/ ٣١١)

٨١ - **ابْنِ عَبَّاسٍ** دەڵێ : هەرکەسێک لە گەورە و بچوک نێر و مێ سەری ئاژەڵیان بڕی بیخۆن.

المصنف لعبدالرزاق( ٨٥٥٢)

٨٢ - **الشَّعْبِيِّ** دەڵێ : هەرکەسێک لە گەورە و بچوک نێر و مێ سەری ئاژەڵیان بڕی بیخۆن.

المصنف لعبدالرزاق( ٨٥٥٣)

٨٣ - **مُجَاهِدٍ** دەڵێ : هیچ کێشەیەک لە سەربڕاوی منداڵ و سەربڕاوی ئافرەت لە موسڵمانان و ئەهلی کتاب ـدا نیە . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٥٤)

٨٤- **ابن القطان الفاسي** دەڵێ : بە ئیجماع سەربڕاوی دەستی ئافرەت و بەندە و جاریە درووستە وە هیچ خیلافێکی تێدانیە . الإقناع في مسائل الإجماع (١١٧١٠)

٨٥ - **قَتَادَةُ** دەڵێ : ئەگەر ئافرەتێک مەڕێک سەربڕێت و نەکەوتبێتە ناو حەیزەوە ئەوە سەربڕاوەکەی کێشەی تێدا نیە . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٦٤)

***

## (سەربڕاوی لەش گران)

٨٦ - **إسحاق بن منصور** دەڵێ : وتم بە امام احمد ئایە لەش گران سەردەبڕیت وە نوێژ دەکات ؟ ئیمام وتی : هیچ کێشەیان تێدانیە . مسائل الكوسج (٢٧٩١)

٨٧ - **امام احمد** دەڵێ : لەش گران ناتوانێت ئاژەڵ سەر ببڕێت . معونة أولي النهى(١١/ ١٣٨)

٨٩ - **ابن القطان الفاسي** دەڵێ : بە ئیجماع سەربڕاوی دەستی لەش گران یان ئەو ئافرەتەی لە حەیزدایە دەخورێت . الإقناع في مسائل الإجماع( ١٧١٢)

٩٠ - **ابن المنذر** دەڵێ : سەربڕاوی کەسی لەش گران وەک کەسێکە کە لەسەر خاوێنیە وە ئەوەشی ڕوخسەتی داوە نمونەی : حسن البصري و الحكم و ليث بن سعد و أحمد بن حنبل و إسحاق بن راهويه و ابي ثور و الكوفي وە هیچ یەکێکم نەزانیوە ڕێگری لەوە بکات وە ئافرەتی حەیزدار هەمان شتە .

الإشراف لابن المنذر( ١٧١٢)

❊❊❊

## (سەربڕاوی منداڵ)

٩١ - **ابْن مَسْعُود** دەڵێ : سەربڕاوی منداڵ هیچ کێشەیەکی تێدا نیە . التاريخ الكبير للبخاري (٢٦٤٢)

٩٢ - **ابْنِ طَاوُسٍ** دەڵێ : پرسیار لە باوکم کرا دەربارەی سەربڕاوی مناڵ ؟ وتی : ئەگەر توانای چەقۆ گرتنی هەبێی هیچ کێشەیەکی تێدا نیە . المصنف لعبدالرزاق( ٨٥٥٥)

٩٣ - **الزُّهْرِيِّ** دەڵێ : نابینم کێشەیەک هەبێت لە سەربڕاوی مناڵ ئەگەر توانای سەربڕینی هەبێت و بسم الله بکات . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٥٦)

٩٤ - **ابن المنذر** دەڵێ : هەموو ئەوانەی زانستم لێوەی لەبەرکردووە ئیجماعیان لەسەر حەڵاڵ بوونی سەربڕاوی ئافرەت و منداڵ هەبووە ئەگەر توانای سەربڕینیان هەبێت . الإجماع لابن المنذر( ٢٢٢)

❋❋❋

## (سەربڕاوی ئەو کەسەی فیقهی لە ئیسلامدا نیە )

٩٥ - **کیسان** دەڵێ: کەسانێکـ لە بازاڕەکاندا هەبوون تازە موسڵمان ببوون وە هیچ فیقهێکیان لە ئیسلامدا نەبوو بۆیە سەربڕاویان جوان نەبوون بۆیە ئیمام عومەر فەرمانی کرد کە لە بازاڕیان دەربێنن تا فیقهیان دەبێت لە ئیسلامدا . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٥٩)

**لێدوانم** : ئەو موسڵمانەی کە زانستی نیە بە سەربڕاو باش نیە ئاژەڵ سەرببڕێت تا فێرە فیقهی سەربڕین دەبن.

٩٦ - **قاسم بن محمد** دەڵێ : ئیمامی عومەر چوو بەلای قەسابخانەیەکـ پرسیاری کرد : کێ بۆتان سەر دەبڕێت ؟ وتیان : ئەم دەشتەکیە ئیمام عومەریش پرسیاری ئیسلامەتی و فیقهی سەربڕین و نوێژی لێ کرد ئەویش جوان نەیزانی چەند جەلدەیەکی لێدا لەپاشاندا وتی : با بۆتان سەر نەبڕن ئیللا ئەو کەسەی نوێژ لەبەر دەکات. المصنف لعبدالرزاق (٨٥٥٨)

٩٧ - **معقل بن یسار** بە **عبدالله بن عامر** وت : گۆشتی بازاڕەکانی ئێوە ناخۆم چوونکە کەسانێک لە بازاڕەکانتان گۆشت دەفرۆشن کە هیچ فیقهێکیان لە ئیسلامدا نیە. الزهد لإمام أحمد (١٢٣٢)



## (سەربڕاوی ئەو کەسەی خەتەنە نەکراوە)

٩٨ - **قَتَادَةَ** دەڵێ : ابن عباس سەربڕاوی ئەو کەسەی بە درووست نەزانیوە کە خەتەنە نەکراوە وە وتی : نە شایەتی لێ قەبوڵ دەکرێت وە نە نوێژی لێ قەبوڵ دەکرێت . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٦٢)

٩٩ - **مَعْمَرٌ** دەڵێ : پرسیارم لە حماد کرد دەربارەی سەربڕاوی کەسێکی خەتەنە نەکراو ؟ ئیمام وتی : سەربڕاوی کێشە نیە وە شایەتی و نوێژیشی لێ قەبوڵ دەکرێت . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٦٢)

١٠٠ - **حسن البصري** دەڵێ : سەربڕاوی خەتەنە نەکراو هیچ کێشەیەکی تێدا نیە . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٦٣)

١٠١ - **مَعْمَرٍ** دەڵێ : بە قەتادەم وت : خەتەنە نەکراوێک مەڕێک یان مانگایەک دەدۆشێت ئایە درووستە ؟ قەتادە وتی : کێشەی تێدا نیە . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٦٤)

١٠٢ - **إسحاق بن منصور** دەڵێ : وتم بە ئیمام احمد ئایە سەر بڕاوی خەتەنە نەکراو دەخورێت ؟ ئیمام وتی : هیچ کێشەیەکی تێدا نیە . مسائل الكوسج (١٥٢٦)

١٠٣ - **أبو طالب** دەڵێ : وتم بە باوکی عبدالله امام احمد : ئەگەر گاورێک خەتەنە نەکراو بێت چی دەڵێیت دەربارەی سەربڕاوی ؟ وتی : لە گاورەکان گاورێک خەتەنە نەکرابێت ؟ وتم : بەڵێ وتی : ابن عباس زۆر لەسەری توند بووە وتم : دەربارەی چی دەڵێ ؟ وتی : زۆر توند بووە وتم : یانی دوور کەوینەوە لە کڕینی گۆشت لێی ؟ امام وتی : بەڵێ . أحكام أهل الملل للخلال (١٠٣٥)

١٠٤ - **ابن عباس** دەڵێ : سەربڕاوی خەتەنە نەکراو ناخورێت . الجامع لعلوم الإمام أحمد (١٢ / ٤٧٠)

١٠٥ - **عكرمة** دەڵێ : سەربڕاوی خەتەنە نەکراو ناخورێت . الجامع لعلوم الإمام أحمد (١٢ / ٤٧٠)

١٠٦ - **امام احمد** دەڵێ : خەتەنە نەکراو نە سەر بڕاوی دەخورێت نە شایەتی لێ وەردەگیرێت نە نوێژیشی قبوڵە نە حەجیشی قبوڵە . الجامع لعلوم الإمام أحمد (١٢ / ٤٧٠)

١٠٧ - **الفضل بن زياد** دەڵێ : پرسیارم لە امام احمد کرد دەربارەی سەربڕاوی کەسێکی خەتەنە نەکراو ؟ وتی : ابراهيم النخعي و حسن البصري کێشەی تێدا نابینن تەنها ابن عباس لەسەری توند بووە .

الجامع لعلوم الإمام أحمد (١٢ / ٤٧٠)

١٠٨ - **امام احمد** دەڵێ : ئەگەر پیاوێک موسڵمان بوو وە تەمەنی گەورە وە ترسا لەوەی خۆی خەتەنە بکات ئەوە لای من ڕوخسەتی هەیە . الجامع لعلوم الإمام أحمد (١٢ / ٤٧٠)

١٠٩ - **امام احمد** دەڵێ : حسن البصري دەڵێ : سەیرم بەو پیاوە دێ (ئەمیری شاری بەسرە) گەیشت بە پیرە پیاوانێکی خەڵکی کیکر پێی وتن : دینتان چیە ؟ وتیان : موسڵمان نین ئەویش فەرمانی کرد تەفتیشیان بکەن بینیان خەتەنە نەکراو بوون ئەویش بەو زستانە فەرمانی کرد گشتیان خەتەنە بکرێن حسن البصري وتی : پێم گەیشتەوە هەندێک لەو پیرە پیاوانە بەهۆی سەرماوە مردن کەچی لە ڕۆم و فارس و حەبەشی لەگەڵ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم موسڵمان دەبوون بەڵام تەفتیشی هیچ یەکێکیان نەکراوە.

**امام احمد** وتی : بۆیە ئەو پیرە پیاوانە لای من عوزریان هەیە . تحفة المودود(٢٠٤، ٢٠٥)

**لێدوانم** : بابەتێکی فیقهی تر سەربڕاوی دەستی نێرە موک حەڵاڵە و دەخورێت بەهۆی گشتگیری بەڵگەکان وە نەبوونی بەڵگەیەک کە نێرەک موک جیابکاتەوە

❊❊❊

## سەربڕاوی خەسێن دراو (گون دەرهێنراو)

١١٠ - **ئیمامی مالیک** دەڵێ : حەز بە سەربڕاوی کەسی خەسێندراو ناکەم بەڵام ئەگەر سەری بڕی بیخۆن. العتبية (٣ /٢٩١)



## سەربڕاوی لاڵ (ئەوکەسەی وەستاوە لە قسە)

١١٢ - **جَابِرٍ** دەڵێ : پرسیارم لە شەعبی کرد ئایە سەربڕاوی کەسی لاڵ چۆن دەکرێت ؟ وتی : ئاماژەی ئاسمان دەکات. المصنف لعبدالرزاق (٨٥٦٦)

١١٣ - **إسحاق بن منصور** دەڵێ : پرسیارم لە امام احمد کرد ئایە سەربڕاوی کەسی لاڵ چۆن دەکرێت ؟ وتی : ئاماژەی ئاسمان دەکات . مسائل الكوسج (٢٨٠٩)

١١٤ - **خالد الحذاء** دەڵێ : پرسیار لە عکرمة کرا چۆن کەسی لاڵ ئاژەڵ سەردەبڕێت ؟ ئیمام وتی : بە دەستەکانی ئاماژەی ئاسمان دەکات . مسائل صالح (٨٦٢)

١١٥ - **إبن قدامة** دەڵێ : لاڵ لەکاتی سەربڕیندا ئاماژەی ئاسمان دەکات لە جێگای قسەکردن ئەو ئاماژەکردنە بەڵگەیە لەسەر مەبەستی کە بسم الله کردنە .

١١٦ - **الشعبي** دەڵێ : بەڵگەش لەسەر ئەوە فەرموودەی ئەبی هريرة ـەيە كە دەڵێ : پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم جاریەکی ئەعجەمی لاڵی لەگەڵ بوو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەوە ئیماندارەیە ئازادی بکەم ؟ پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم پرسیاری لە جاریەکە کرد : الله لە کوێیە ؟ ئەویش ئاماژەی بۆ ئاسمان کرد پێی وت : من کێم ؟ ئەویش بە پەنجەکانی ئاماژەی بۆ پێغەمبەرکرد صلى الله عليه وسلم پاشان بۆ ئاسمان پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم بەو پیاوەی وت : ئازادی بکە ئەوە ئیماندارە . مسند أحمد (٢٩١) سنن أبي داود (٢٠٧) المغني (١٣/ ٣١٣)

١١٧ - **ابن المنذر** دەڵێ : ئیجماعیان هەیە لەسەر حەڵاڵێتی سەربڕاوی کەسی لاڵ . الإجماع لابن المنذر (٢٢٠)

١١٨ - **ابن القطان الفاسي** دەڵێ : زانایان ئیجماعیان لەسەر حەڵالیەتی خواردنی سەربڕاوی کەسی لاڵ هەیە . الإقناع في مسائل الإجماع (١٨١١)



## (سەربڕاوی دەستی دز)

١١٩ - **عَمْرِو بْنِ مُسْلِمٍ** دەڵێ : پرسیارم لە طاوس و عكرمة كرد دەربارەی سەربڕاوی دەستی دز ؟ بە درووستیان نەزانیوە وە نەهیان کرد لە خواردنی . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٦٧)

١٢٠ -**عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَزِيدَ الْهُذَلِيِّ** دەڵێ : پرسیارم لە سعيد بن المسيب كرد دەربارەی بەندەیەک کە مەڕێک یاخود مانگایەک دەدزێت دواتر سەری دەبڕێ ؟ وتی : هیچ کێشەیەک لە سەربڕاوەکەی نابینم .

المصنف لعبدالرزاق (٨٥٦٨)

١٢١ - **مَعْمَرٍ** دەڵێ : پرسیارم لە الزهري كرد دەربارەی سەربڕاوی دەستی دز ؟ ئەویش وتی : کێشەی تێدانیە . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٦٩)

١٢٢ - **إسحاق بن منصور** دەڵێ : پرسیارم لە احمد كرد دەربارەی سەربڕاوی دەستی دز ؟ وتی : کێشەی تێدا نیە . مسائل الكوسج (١٥٢٣)

١٢٣ - **عبد اللَّه بن الإمام أحمد** دەڵێ : گوێم لە باوکم بوو دەی وت : ئەگەر پیاوێک مەڕێک بدزێت لە پاشان سەری ببڕیت بۆخۆی حەڵاڵ نیە بیخوات وتم بە باوکم : ئەی ئەگەر گەڕاندیەوە بۆ خاوەنەکەی ؟ وتی : ناخورێت . مسائل عبد اللَّه (٩٧٦)



## (سەربڕاوی شێت و سەرخۆش)

١٢٤ - **ئیمامی مالیک** دەڵێ : ئەگەر بێتوو شێت و سەرخۆش ئاژەڵێکیان سەربڕی وە هەردووکیان لەسەر عەقڵ نەبوون ئەوە درووست نیە سەربڕاویان بخۆیت. المدونة (١/ ٢٣٤)

١٢٥ - **ئیمامی شافعی** دەڵێ : درووست نیە بەڵام ناڵێم حەڕامە. الأم (٢/ ٤١٥)

١٢٦ - **أبن المنذر** دەڵێ : وتەی ئیمامی مالیک سەحیح ترە . الإشراف لابن المنذر( ١٧١١)

١٢٧ - **ابن المنذر** دەڵێ : سەربڕاوی دەستی شێت و سەرخۆش خواردنی درووست نیە . الإقناع( ٣٨٥)

**لێدوانم** : پوختەی قسە بریتیە لەوەی سەربڕاوی دەستی شێت و سەرخۆش خواردنی درووست نیە.



**(حوكمی سەربڕاوی غەیری قیبلە)**

١٢٨ - عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ضَحُّوا، وَطَيِّبُوا بِهَا أَنْفُسَكُمْ؛ فَإِنَّهُ لَيْسَ مِنْ مُسْلِمٍ يُوَجِّهُ ضَحِيَّتَهُ إِلَى الْقِبْلَةِ إِلَّا كَانَ دَمُهَا، وَفَرْثُهَا، وَصَوْفُهَا حَسَنَاتٍ مُحْضَرَاتٍ فِي مِيزَانِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ (ضعيف)

**عائیشه** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی : قوربانی بکەن وە نەفستان پێی پاک بکەنەوە چونکە هیچ موسڵمانێک نیە قوربانیەکەی ڕوو لە قیبلە بکات ئیللا خوێنەکەی و پیسیەکەی و خوریەکەی چاکە دەچێتە سەر تەرازووی لە قیامەت .المصنف لعبدالرزاق (٨١٦٧)

١٢٩ - **نافع** دەڵێ : ابن عمر پێی درووست نەبوو لەو سەربڕاوە بخوات کە لە غەیری قیبلە سەربڕدراوە . المصنف لعبدالرزاق( ٨٥٨٥)

١٣٠ - **حماد** دەڵێ : پرسیارکرا لە ابراهیم دەربارەی پیاوێک ئاژەڵێک سەردەبڕێ بۆ قیبلە دواتر مەیلی بۆ غەیری قیبلە دەڕوات ئایە خواردنی درووستە ؟ وتی : کێشەی تێدانیە جابر دەڵێ : زیانی تێدانیە ڕوو لە قیبلە بکەیت یان نەکەیت . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٨٦)

١٣١ - **ابن سيرين** دەڵێ : خێرترە سەربڕاوەکە ڕوو لە قیبلە بکەیت . المصنف لعبدالرزاق( ٨٥٨٧)

١٣٢ - **عبدالله بن عون** دەڵێ : پرسیارم لە قاسم کرد دەربارەی پیاوێک ئاژەڵ سەر دەبڕێ بۆ غەیری قیبلە ئایە سەربڕاوەکەی دەخورێت ؟ لە وەڵامدا وتی : چی کێشەیەک لەوەدایە ؟ . المصنف لعبدالرزاق( ٨٥٨٨)

١٣٣ - پرسیار لە **ابن قاسم** کرا : ئایە بینیوتە ئیمام مالیک فەرمانی کردبێت لەوەی سەربڕینی ئاژەڵەکان ڕوو لە قیبلە بکرێت ؟ لە وەڵامدا وتی : بەڵێ مالیک وتی : سەربڕاوەکان ڕوو لە قیبلە بکە . المدونة لابن القاسم (١/ ٥٣٤)

١٣٤ - **ئیمامی شافعی** دەڵێ : لام خۆشەویسترە پیاو لەکاتی سەربڕینەکەیدا ڕوو لە قیبلە بکات و بسم الله بکات . الأم (٨/ ٤١٣)

١٣٥ - **أبو طالب** دەڵێ : وتم بە ئیمام احمد : ئایە درووستە سەر ببڕدرێت بۆ غەیری قیبلە ؟ وتی : نا وتم : ئەی لات خۆشەویسترە ڕوو لە قیبلە بکرێت ؟ وتی : بەڵێ . العدة (٥/ ١٦٢٨)

١٣٦ - **ابن المنذر** دەڵێ : خێرترە سەربڕاوەکان ڕوو لە قیبلە بکرێت بەڵام حەڕامیش یە کە بۆ غەیری قیبلە سەربڕدرابێت . الإجماع( ٣٨٥)

١٣٧ - **ابن قدامة** دەڵێ : خێرترە ڕوو لە قیبلە بکرێت ئەوەش وتەی ابن عمر و ابن سیرین و الثوري و عطاء و الشافعي و أصحاب الرأي ـیە لەبەر ئەوەی ئەهلی کتاب بۆ غەیری قیبلە سەری دەبڕن و حەڵاڵیشە . الفروع (٦/ ٣١٨)

❊❊❊

## (نیەت هێنان لەسەر سەربڕاوەکان)

١٣٨ - **الخطابي** دەڵێ : بزانە پێویستە لەسەر سەربڕاوەکانمان نیەتمان بۆی هەبێت بەشێکی زۆر ڕیوایەتی ئیجماع دەکەن لەو بارەیەوە . مواهب الجليل (٢ /٢٣٣)



## (چۆنیەتی بسم الله کردن لەسەر سەربڕاوەکان)

١٣٩ - عَنْ أَنَسٍ قَالَ : ضَحَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ ، فَرَأَيْتُهُ وَاضِعًا قَدَمَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا، يُسَمِّي وَيُكَبِّرُ، فَذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ.

**ئەنەس** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم قوربانی کرد بە دوو بەرانی سپی تێکەڵ بەڕەش بینیم لەسەر زەوی ڕای خست و قاچەکانی خستە لای سەریەوە بسم الله ــی کرد و الله اكبر ــی کرد دواتر بەدەستی خۆی سەری بڕین . صحيح البخاري (٥٥٥٨) صحيح مسلم (١٩٦٥)

١٤٠ - **معتمر** لە باوکیە دەڵێ : ئەنەس ئەگەر بەهاتبا ئاژەڵێکی سەرببڕیبا دەی وت : بسم الله الله اكبر.مطالب العالية (٦/ ٢٧٢)

١٤١ - **حسن** دەڵێ : لەکاتی سەربڕیندا بڵێن : بسم الله الله اكبر یاالله بۆتۆیە وە لەتۆیەوە لە فلانی وەرگرە

مطالب العالية (٦/ ٢٧٢)

١٤٢ - **ابن سيرين** دەڵێ : ماشاء الله بسم الله الله أكبر . مطالب العالية (٦/ ٢٧٢)

## (ئەو ئاڵەتەی کە ئاژەڵەکەی پێ سەر دەبڕی)

١٤٣ - **عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ** : أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم قَالَ : مَا أَنْهَرَ الدَّمَ، وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ، فَكُلُوهُ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ.

**رافع بن خديج** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەرشتێک خوێنی دەرێژریت وە ناوی الله ــی لەسەر دەهێنرێت بیخۆن بەڵام نابێی بە ئێسک و نینۆک سەرببڕێن. صحيح البخاري(٢٥٠٧)

**لێدوانم** : لێرە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە عموم ـی فەرمووی : هەرشتێک خوێنی ڕشت تخصيص ـی کرد بە ئێسک و نینۆک کە نابێت ئاژەڵی پێ سەرببڕیت غەیری ئەو لە دار و بەرد و شوشە و ئاسن درووستە.



## (سەر بڕین بە بەرد و دار)

١٤٤ - **كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ يُخْبِرُ ابْنَ عُمَرَ**، أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ جَارِيَةً لَهُمْ كَانَتْ تَرْعَى غَنَمًا بِسَلْعٍ، فَأَبْصَرَتْ بِشَاةٍ مِنْ غَنَمِهَا مَوْتًا، فَكَسَرَتْ حَجَرًا فَذَبَحَتْهَا، فَقَالَ لِأَهْلِهِ : لَا تَأْكُلُوا حَتَّى آتِيَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَسْأَلَهُ، أَوْ حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْهِ مَنْ يَسْأَلُهُ. فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْ بَعَثَ إِلَيْهِ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأَكْلِهَا.

**ابْنَ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ** دەڵێ : ابن عمر هەواڵی پێداین کە باوکم جاریەکی هەبوو مەڕەکانی لە سلع (چیایەکی بەناوبانگە لە شاری مەدینە) دەلەوەڕاند بینی مەڕێک لە مێگەلەکە مردووە بەردێکی شکاند و هێنای سەری بڕی بە خێزانەکەم وت : مەیخۆن تا پێغەمبەر دێت صلى الله عليه وسلم یاخود یان کەسێک دەنێرم تا پرسیاری لێدەکات پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم فەرمانی کرد بە خواردنی . صحيح البخاري (٥٥٠١)

١٤٥ - **عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ** : قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ أَحَدُنَا أَصَابَ صَيْدًا وَلَيْسَ مَعَهُ سِكِّينٌ، أَيَذْبَحُ بِالْمَرْوَةِ وَشِقَّةِ الْعَصَا ؟ فَقَالَ : أَمْرِرِ الدَّمَ بِمَا شِئْتَ، وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ .

**عدي بن حاتم** دەڵێ : وتم ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئایە دەبینیت کە یەکێک لە ئێمە نێچیرێکی گرت و چەقۆمان لانەبوو ئایە بە بەرد و لەت کردنی دار سەری ببڕین ؟ وتی : خوێن بڕێژە بەوەی کە دەتەوێت وە ناوی الله تعالى ـى لەسەر بێنە . سنن أبي داود (٢٨٢٤)

١٤٦ - **عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ** ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي حَارِثَةَ ، أَنَّهُ كَانَ يَرْعَى لِقْحَةً بِشِعْبٍ مِنْ شِعَابِ أُحُدٍ، فَأَخَذَهَا الْمَوْتُ، فَلَمْ يَجِدْ شَيْئًا يَنْحَرُهَا بِهِ، فَأَخَذَ وَتِدًا فَوَجَأَ بِهِ فِي لَبَّتِهَا، حَتَّى أُهَرِيقَ دَمُهَا، ثُمَّ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَهُ بِذَلِكَ، فَأَمَرَهُ بِأَكْلِهَا.

**عطاء بن يسار** دەڵێ : پیاوێک لە بني حارثة وشترەکانی دەلەوەڕاند لە دۆڵێک لە دۆڵەکانی چیای ئوحود دانەیەک خەریک بوو مردن بیگرێت هیچ شتێکی لانەبوو تا سەری ببڕێت تیخێک لە بەردی دەستدایە لە سەرووی سنگیەوە ڕای وەشاند تا ئەوەی خوێنی ڕژا لەپاشان هاتە خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەواڵی ئەو شتەی پێدا ئەویش فەرمانی خواردنی پێ کرد . سنن أبي داود (٢٨٢٣)

١٤٧ - **إبراهيم** دەڵێ : بە هەموو شتێک ئاژەڵ سەربڕە جگە بە چوار شت نەبێت : السن : ئێسک الظفر : نینۆک القرن : قۆچ یان شاخ العظم : ئێسک . المصنف لابن أبي شيبة (١٩٨٠١)

**لێدوانم** : حەڕامە ئاژەڵ بە کارەبا و جیهاز بکوژیتەوە لەبەر ئەوەی هیچ مەرجێکی سەربڕینی شەرعی تێدانیە بۆیە گۆشتەکەی حەڕامە .

❊❊❊

## (سەربڕینی پشتە سەری ئاژەڵ یان شکاندنی گەردەن)

١٤٨ - **ئیمامی عەلی** دەڵێ : مریشک ئەگەر سەری بڕدرا بە سەربڕینێکی خێرا ئەوە من دەیخۆم .

المصنف لعبدالرزاق (٨٥٨٩)

١٤٩ - **نافع** دەڵێ : ابن عمر ئەو مەڕەی نەدەخوارد کە ملی شکێنراوە . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٩٠)

١٥٠ - **مجاهد** دەڵێ : مەڕێک ئەگەر بێتوو ملی لە پشتەوە بشکێندرێت نا پەسەندە بەڵام خواردنی کێشەی نیە . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٩١)

١٥١ - **أبي إسحاق** دەڵێ : پرسیار لە الشعبي کرا دەربارەی کەڵەشێرێک کە لە پشتە ملیەوە سەر بڕدراوە ئایە دەخورێت ؟ لە وەڵامدا وتی : ئەگەر ویستت بیخۆ . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٩٢)

١٥٢ - **منصور** دەڵێ : پرسیار لە ابراهیم کرا دەربارەی سەربڕاوێک چەقۆی بە گشت گەردەنیدا ڕۆیشتووە هەمووی بڕیوە ئایە دەخورێت ؟ وتی : کێشەی تێدا نیە . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٩٣)

١٥٣ - **الحكم بن عتيبة** دەڵێ : پرسیار لە يحيى بن الجزار کرد دەربارەی مریشکێک چەقۆکەی لاربۆیەوە تا سەری بڕی ؟ وتی : ئەگەر بە ئەنقەست نەبووە بیخۆن . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٩٧)

١٥٤ - **عطاء** دەڵێ : ئەگەر سەربڕێک ئاژەڵ یان باڵندەیەکی سەربڕی سەری بەدیار کەوت لەوەی زۆر بڕدراوە ئەگەر بە ئەنقەست نەکراوە بیخۆن . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٩٩)

١٥٥ - **أبي نجيح** دەڵێ : هەرکەسێک وشترێک لە پشتەوەی سەر ببڕیت بە ئەنقەست مەیخۆن .

المصنف لعبدالرزاق (٨٥٩٨)

١٥٦ - **معمر** دەڵێ : پرسیار لە زوهری کرا دەربارەی پیاوێک ئاژەڵێک بە شمشێرەکەی دەپەڕێنێت ئایە دەخورێت ؟ وتی : خراپترین کاری کردووە بەڵام بیخۆن . المصنف لعبدالرزاق (٨٦٠٠)

١٥٧ - **عبدالله بن الإمام أحمد** دەڵێ : پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی پیاوێک ئەگەر ئاژەڵێک سەر ببڕێت بەڵام سەری سەربڕاوەکەی بە ئەنقەست سەرکەکەی سەربڕی ؟ ئیمام وتی : ئەگەر چەقۆکەی پێش کەوت کێشەی تێدانیە وە ئەگەر بە ئەنقەست بوو ئەوە پێم باش نیە . مسائل عبدالله (٩٨٠)

١٥٨ - **ابن المنذر** دەڵێ : ئەگەر مەڕێکت سەربڕی یان مریشکێک لە پشتە ملیەوە حەڕام نیە خواردنی بەڵام نا پەسەندە . الإجماع (٣٨٥)



**قاعیدەیەک هەیە لە سەربڕاوی أهل الکتاب ئەویش :**

(الأصلُ حِلُّ ذبائح أهل الکتاب)

ئەسڵ تێیدا حەڵاڵ بوونی سەربڕاوی یەهود و گاورەکانە

**بەڵگەش:**

١٥٩ - ( الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ) المائدة : ٥

**واتە** : خواردەمەنی ئەهلی کتێب و نیکاحی ژنانیان حەڵاڵە: لەئەمڕۆ بەدواوە هەمووشتێکی چاک و پاکتان بۆ ڕەوایە و سەربڕاوی دەستی ئەوانەی نامەیان پێدراوە ڕەوایە بۆتان و دەتوانن بیخۆن وە خواردن و سەربڕاوی دەستی ئێوەیش بۆ ئەوان حەڵاڵەو ڕێی پێدراوە.

١٦٠ - **ابن عمر** و **ابن الصامت** و **ابي الدرداء** و **ابن عباس** و **مجاهد** و **عطاء** و **الضحاك** و **السدي** و **سعيد بن جبير** و **سعيد بن المسيب** و **مكحول** و **ابراهيم** و **الأوزاعي** و **الزهري** و **قتادة** و **ربيعة** و **الشعبي** و **ابن زيد** و **مقاتل بن سليمان** و **مالك** و **الشافعي** و **احمد** و **حرب** و **خلال** و **ابن بطة** لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا (وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ) دەڵێن : طَعَامُهُم ذَبَائِحُهُم : خواردنەکانیان واتە سەربڕاوەکانیان . تفسير ابن أبي حاتم . تفسير قتادة . تفسير عبدالرزاق . تفسير مجاهد . تفسير مقاتل . تفسير ابن المنذر . تفسير الطبري

١٦١ - **ابن مسعود** دەڵێ : ئەگەر لە نێوان فارس و نبط دابەزین ئەگەر گۆشتتان کڕی پرسیار بکەن ئەگەر بێتوو سەربڕاوی یەهودی و گاورەکان بوو ئەوە بیخۆن چونکە بۆتان حەڵاڵە وە ئەگەر سەر براوی مەجوسی بوو مەیخۆن . المصنف لعبدالرزاق( ٨٥٧٨)

١٦٢ - **ابن عباس** دەڵێ : سەربڕاوی یەهود و گاورەکان بۆتان حەڵاڵە لەبەر ئەوەی باوەڕیان بە تەورات و ئینجیل هێناوە . تاريخ الكبير للطبراني( ١١٧٧٩)

١٦٣ - **عمرو بن الضريس الأسدي** دەڵێ : پرسیارم لە الشعبي کرد وتم : ئێمە جەنگی زەوی ئەرمەنی و گاورەکان دەکەین خواردن و سەربڕاوەکانیان چۆن دەبینیت ؟ شەعبی وتی : ئێمە ئەگەر جەنگ و جیهادی هەر زەویەکمان کردبا پرسیار لە خەڵکەکەمان دەکرد ئەگەر بیانگۆتبا : یەهودن یان گاورین سەربڕاوەکانمان دەخوارد . المصنف ابن أبي شيبة (٣٢٦٩٥)

١٦٤ - **ئیمامی شافعی** دەڵێ : (طَعَامُهُم) لای هەندێک لە ئەهلی تەفسیر کە لێیانەوە لەبەرمان کردووە واتە(ذَبَائِحُهُم) ئاثارەکان بەڵگەن لەسەر حەڵاڵ بوونی سەربڕاوەکانیان . سنن البيهقي (٩/ ٤٧٤)

١٦٥ - **ابن القطان الفاسي** دەڵێ : ئیجماع لە سەربڕاوی اهل الكتاب ئەوە کە سەربڕاویان حەڵاڵە و دەخورێت ئەگەر بێتوو ناوی الله تعالى ـشیان لەسەر نەهێنابێت بەومەرجەی ناوی غەیری الله ـشیان لەسەر نەهێنابێت . الإقناع في مسائل الإجماع (١٨٠٩)

١٦٦ - **ابن المنذر** دەڵێ : ئیجماعی ئەهلی علم لەسەر ئەوەیە کە سەربڕاوی ئەهلی کتاب بۆ ئێمە حەڵاڵە.الإجماع لابن المنذر( ٣٨٧)

١٦٧ - **ابن عبدالبر** دەڵێ : ئیجماع لە سەربڕاوی اهل الكتاب ئەوە کە سەربڕاویان حەڵاڵە و دەخورێت ئەگەر بێتوو ناوی الله تعالى ـشیان لەسەر نەهێنابێت بەومەرجەی ناوی غەیری الله ـشیان لەسەر نەهێنابێت . التمهيد (٥/ ٢٥٠)

١٦٨ - **البغوي** دەڵێ : ئەوەی لە ڕەچەڵەکی نەوەی ئیسرائیل بێت ئیجماع لەسەر ئەوەیە سەربڕاو و ژنیان حەڵاڵە . شرح السنة( ١١ /١٧١)

❊❊❊

## (سەربڕاوی ژن و منداڵەکانیان)

١٦٩ - **اسحاق بن منصور** دەڵێ : وتم بە ئیمام احمد چی دەڵێی دەربارەی سەربڕاوی دەستی ژن و منداڵی أهل الكتاب ؟ ئیمام وتی : هیچ کێشەی تێدانیە ئەگەر توانای سەربڕینیان هەبێت.

مسائل الكوسج( ٢٨١٣)

١٧٠ - **الميموني** دەڵێ : پرسیارم لە ئیمام احمد کرد وتم : ئەگەر بێتوو منداڵ و جاریەکی اهل الكتاب مەڕێکیان سەربڕی حوکمی چیە ؟ ئیمام وتی : کێشەی تێدانیە گەر توانایان لەسەر سەربڕین هەبێت.

أحكام أهل الملل للخلال( ٣٧٨)

١٧١ - **صالح** دەڵێ : پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی سەربڕاوی دەستی ئافرەتێکی اهل الكتاب ؟ لە وەڵامدا وتی : کێشەی تێدانیە گەر توانای لەسەر سەربڕین هەبێت . مسائل صالح( ٣٢١)

١٧٢ - **ابن القطان الفاسي** دەڵێ : ئیجماع لەسەر ئەوەیە کە سەربڕاوی ژن و منداڵی اهل الكتاب خواردنی درووستە و کێشەی تێدانیە گەر توانایان لەسەر سەربڕین هەبێت . الإقناع في مسائل الإجماع( ١٨١٣)

١٧٣ - **ابن المنذر** دەڵێ : ئیجماعی ئەهلی علم لەوانەی لێیانەوە لەبەرمان کردوون لەسەر ئەوەیە کە سەربڕاوی ئافرەت و منداڵی اهل الكتاب حەڵاڵە خواردنی و کێشەی تێدانیە گەر توانایان لەسەر سەربڕین هەبێت. الإشراف لابن المنذر (٣/ ٤٤٥)

١٧٤ - **ابن قدامة** دەڵێ : نەم زانیوە هیچ خیلافێک هەبێت لە سەربڕاوی دەستی ژن و منداڵی اهل الكتاب و موسڵمانان . المغني (٨/ ٥٨٠)

## سەربڕاوی نصارى بني تغلب (نصارى العرب)

گاورە عەربیەکان یان گاورەکانی کوڕی تغب بن وائل هۆزێکی عەرەبین سەرەتا لە قحطان و حیجاز دەژیان دواتر کۆچیان کرد بۆ عێراق لە ناوچەکانی نێوان الخابور و دیجلە و فوڕات دەژیان نیمچە دەسەڵاتێکیان هەبوو لە نێوان موسڵ و حەلەب بە ناوی حەمدانیەکان.

**سەلەف دوو مەزهەبیان هەیە لە سەر سەربڕاوی ئەو هۆزە گاورە ئەوانیش:**

**یەکەم** : خواردنیان حەڕامە

١٧٥ - **عمر بن الخطاب** دەڵێ : نصارى العرب لە ڕیزی اهل الكتاب نیە وە سەربڕاوەکانیشیان بۆ ئێمە حەڵاڵ نیە . مسند الإمام الشافعي (١/ ٢٠٩)

١٧٦ - **ابن عباس** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە لە خواردنی سەربڕاوی نصارى العرب . الحلية لأبي نعيم (٨/ ٥٥) مسند ابن جعد (٣٤٢٥)

١٧٧ - **علقمة** دەڵێ : ابن مسعود نەهی کردووە لە خواردنی نصارى العرب و مجوس ئەگەر بێتوو ناوی الله ـشی لەسەر بێنن . مشكل الأثار (١٥/ ٤٠٣)

١٧٨ - **عبيدة السلماني** دەڵێ : ئیمامی عەلی نەهی کردووە لە سەربڕاوی نصارى بن تغلب و دەی وت : ئەوانە دەست ناگرن بە گاورەکانەوە ئیللا بە خواردنی مشروب نەبێت . كتاب الأم للشافعي (٢/ ١٩٦) المصنف عبدالرزاق (٨٥٧٠)

١٧٩ - **ابراهيم النخعي** دەڵێ : ئیمامی عەلی نەهی لێکردووین لە خواردنی سەربڕاوی نصارى العرب و ژنەکانیان وە دەی وت : ئەوانیش لە موشریکانی عەرەبن . المصنف ابن أبي شيبة (١٦١٩٣)

١٨٠ - **عمرو بن حزم** دەڵێ : پرسیارکرا لە جابر بن زید دەربارەی ئافرەتەکانی نصارى العرب ئایە بۆ موسڵمانان حەڵاڵە ؟ لە وەڵامدا وتی : ئەوان أهل الكتاب نین وە ئافرەتەکانیشیان حەڵاڵ نیە وە خواردنیشیان حەڵاڵ نین بۆ موسڵمانان . المصنف لابن أبي شيبة (١٦١٩٥)

١٨١ - **الميموني** دەڵێ : ئیمامی احمد وتی : هیچ شتێک نازانم جێگیرتربێت لە وتەی ئیمامی عەلی دەربارەی سەربڕاوی بني تغلب منیش پێم وت : ئایە سەربڕاوی نصارى العرب دەخورێت ؟ وتی : لە ئیمام عەلی ـەوە پێمان گەیشتووە کە سەربڕاویان ناخورێت . أحكام أهل الملل للخلال (٤٤٠)

**دووهەم** : خواردنی حەڵاڵە

**ئەوە وتەی زۆرینەی سەلەفە :**

١٨٢ - **حسن البصري** دەڵێ : نەم زانیوە لە هیچ یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سەربڕاوی بني تغلب حەرام بکات ئیللا ئیمامی عەلی نەبێت . الناسخ والمنسوخ لابن النحاس (١/ ٣٦٥)

١٨٣ - **ثور بن زيد الديلي** دەڵێ : پرسیار لە ابن عباس کرا دەربارەی سەربڕاوی بني تغلب ؟ لە وەڵامدا وتی : هیچ کێشەی تێدانیە لە پاشاندا ئەو ئایەتەی خوێندەوە (وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ) .الموطأ لإمام مالك (١٧٨٦)

١٨٤ - **معمر** دەڵێ: پرسیارم لە الزهري كرد دەربارەی سەربڕاوی نصاری العرب ؟ لە وەڵامدا وتی : هەرکەسێک دینداری بەهەر دینێک بکات ئەوە لەوانە هیچ کێشەیەکی لەسەربڕاوەکانیان نابینم . المصنف لعبدالرزاق( ٨٥٧١)

١٨٥ - **بوخاری** لەسەر وتەکەی **الزهري** دەڵێ: هیچ کێشەیەک لە سەربڕاوی نصاری العرب ـدا نیە بەڵام ئەگەر بیستت ناوی غەیری الله ـیان لەسەر هێنا مەیخۆن بەڵام ئەگەر نەتانبیست ئەوە الله بۆتانی حەڵاڵ کردووە وە کوفرەکەشیان دەزانێت . صحيح البخاري (حديث٩٢)

١٨٦ - **حسن البصري** دەڵێ : هیچ کێشەیەک نیە لەخواردنی سەربڕاوەکانیان . المصنف لابن أبي شيبة (١٦٢٠٠)

١٨٧ - **عطاء الخراساني** دەڵێ : هیچ کێشەیەک نیە لە سەربڕاوەکانیان ئایە وتەی الله ـت نەبیستووە کە دەفەرمووێت(وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلَّا أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ) . المصنف لعبدالرزاق( ٨٥٧٢)

١٨٨ - **الشعبي** دەڵێ : الله تعالى سەربڕاوەکانیانی بۆ حەڵاڵ کردوون . المصنف لعبدالرزاق( ٨٥٧٢)

١٨٩ - **شعبة** دەڵێ : پرسیارم لە حکم و حماد و قتادة کرد دەربارەی سەربڕاوی بني تغلب ؟ وتیان : هیچ کێشەیەک نیە لەخواردنیان . تفسير الطبري( ١١٢٢٧)

١٩٠ - **عكرمة** دەڵێ : هیچ کێشەیەک نیە لەخواردنی سەربڕاوەکانی نصاری العرب . تفسير الطبري( ١١٢٢٢)

١٩١ - **سعيد بن المسيب** دەڵێ : هیچ کێشەیەک نیە لەخواردنی سەربڕاوەکانی نصاری العرب .

تفسير الطبري( ١١٢٢٣)

## (ئاژەڵێکت یەهودی یان گاور ـێک بۆت سەربڕی)

١٩٢ - **ئیمامی عەلی** دەڵێ : قوربانی موسڵمان نابێت یەهودی بۆی سەربڕێت . سنن الكبرى للبيهقي (١٩١٦٦)

١٩٣ - جابر بن عبدالله دەڵێ : درووست نیە قوربانی کردن هیچ کەسێک سەری ببڕیت ئیللا موسڵمان نەبێت . المطالب العالية( ٢٢٩٢)

١٩٤ - **ابن عباس** دەڵێ : درووست نیە مەڕ و ماڵاتەکانتان یەهودی یان گاور بۆتان سەر ببڕێت . سنن الكبرى للبيهقي (١٩١٦٧)

١٩٥ - **عكرمة** دەڵێ : درووست نیە موسڵمان مەڕەکەی بدات بە یەهودیەک تا بۆی سەربڕێت . المصنف لعبدالرزاق( ٨٥٧٧)

١٩٦ - **عكرمة** دەڵێ : سەربڕین دەگونجێت لەنێوان موسڵمان و یەهودی و گاورەکان بکرێت بۆت سەرنابڕن بەڵکو خۆت سەربڕە لەبەر ئەوەی دینەکەمان زاڵ دەبێت بەسەر دینەکەیان . المصنف لعبدالرزاق( ٨٥٧٨)

١٩٧ - **ئیمامی مالیک** دەڵێ : پێم خۆش نیە گاور ئاژەڵەکەت بۆ سەر ببڕێت . النوادر والزيادات (٤/ ٣٦٥)

١٩٨ - **ئیمامی شافعی** دەڵێ : درووست نیە موشریکانی اهل الكتاب ئاژەڵەکەت بۆ سەر ببڕن . سنن البيهقي (٩/ ٤٧٧)

***

## (سەربڕاوی أهل الحرب لە یەهود و گاورەکان)

١٩٩ - **عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ** ، قَالَ : أَصَبْتُ جِرَابًا مِنْ شَحْمٍ يَوْمَ خَيْبَرَ، قَالَ : فَالْتَزَمْتُهُ، فَقُلْتُ : لَا أُعْطِي الْيَوْمَ أَحَدًا مِنْ هَذَا شَيْئًا، قَالَ : فَالْتَفَتُّ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُتَبَسِّمًا.

**عبدالله بن مغفل** دەڵێ : لە جەنگی خەیبەردا جۆرێکی لە دونگ و بەزمان بەدەست کەوت لای خۆم گیردا وتم : هیچ شتێک نابەخشم بە هیچ یەکێک ئەمڕۆ بردرا بۆلای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەویش زەردەخەنەی بۆکرد . صحيح مسلم( ١٧٧٢)

٢٠٠ - **سعيد بن جبير** دەڵێ : هیچ کێشەیەک لە سەربڕاوی أهل الكتاب ـدا نیە لە اهل الحرب.

المصنف لعبدالرزاق (١٠١٧٩)

٢٠١ - **ئیمامی شافعی** دەڵێ : هەرکەسێک لە ڕەچەڵەکی نەوەی ئیسرائیل بێت سەربڕاوی دەخورێت وە ئافرەتی مارە دەکرێت جیاوازی نیە حرب ـی بێت یان أهل الذمة بێ . الأم (٤/ ١٩٣)

٢٠٢ - **عبدالله بن الإمام أحمد** دەڵێ : باوکم وتی : هیچ کێشەیەک نیە لە سەربڕاوی أهل الحرب . أحكام أهل الملل للخلال (٤٩٣)

٢٠٣ - **ابن المنذر** دەڵێ : سەربڕاوی اهل الحرب ڕێگەپێدراوە بە ئیجماع .الإجماع( ٣٨٧)

❊❊❊

## (ئەو سەربڕاوانەی ناوی غەیری الله ـیان لەسەر هێناوە)

**سەلەف سێ مەزهەبی هەیە لەم باسە :**

**مەزهەبی یەکەم :** حەڕامە

٢٠٤ - **میمون بن مهران** دەڵێ : عومەری کوڕی عبدالعزیز کەسانێکی لە موسڵمانان کردە وەکیل خۆی لەسەر گاورەکان لەسەر سەربڕاوەکان ئەگەر ئاژەڵیان سەربڕی ناوی الله ــ لەسەر بێنن وە وازیان لێنەهێنن لەوەی ناوی غەیری الله ــ لەسەر بێت وەرێگری کرد کەوەی لەسەر سەربڕاوەکان شیرک بکەن
المصنف لعبدالرزاق (٨٥٨١)

٢٠٥ - **ئەوزاعی** دەڵێ : پرسیارم لە میمون بن مهران کرد دەربارەی ئەو سەربڕاوانەی گاورەکان بۆ جەژنەکان و کەنیسەکانیان سەردەبڕن ؟ لەوەڵامدا وتی : درووست نیە . أحكام آهل الملل للخلال (١٠٤١)

٢٠٦ - **ئیمامی شافعی** دەڵێ : ئەگەر سەربڕاوی غەیری موسڵمانان ناوی غەیری الله تعالی ـیان لەسەر هات نمونە : بەناوی مەسیح یان غەیری الله تعالی ئەوە حەڵاڵ نیە . الأم (٢٧ ٢٥٤)

٢٠٧ - **ئیمامی احمد** : ئاو گۆشتە ناخورێت کە ناوی غەیری الله ــ لەسەر هێنراوە . أحكام آهل الملل للخلال (٤٤٤)

٢٠٨ - **ابن المنذر** دەڵێ : ئەگەر یەهودی یان گاورێک ناوی الله ــ لەسەر ئاژەڵەکە هێنا درووستە بخورێت بەڵام ئەگەر ناوی الله ــ لەسەر نەهێنا ناوی غەیری ئەوی هێنا وەک بەناوی مەسیح ئەوە درووست نیە بخورێت وە ئەگەر لێمانەوە دیار نەبوو چۆن سەربڕدراوە ئەوە سەربڕاوەکەمان دەخوارد وەک چۆن ئی ئەو موسڵمانانەمان دەخوارد کە لێوەمانەوە دیار نەبوو . الإجماع (٣٧٨)

**مەزهەبی دووەم : حەڵاڵە**

٢٠٩ - **عمير بن الأسود** دەڵێ : پرسیارمان لە أبا درداء کرد دەربارەی بەرانێک بۆ کەنیسە سەربڕدراوە بەدیاری بۆمان هاتووە ئایە لێی بخۆین ؟ وتی : ئەوانە ئەهلی کتاب ـن خواردنیان بۆ ئێمە حەڵاڵە وە فەرمانی بەخواردنی کرد . الطبقات لابن سعد (٢ /١٥٣)

٢١٠ - **عبدالرحمن بن أبي ليلى** دەڵێ : ئیمامی عەلی و ابن عباس و مجاهد پرسیاریان لێکرا : ئەهلی کتاب ناوی غەیری الله لەسەر سەربڕاوەکانیان دەهێنن ئایە دەخورێت ؟ وتیان : الله تعالی کاتێ خواردنی سەربڕاوەکانیانی حەڵاڵ کرد دەیزانی چی لەسەر دەڵێن . المصنف لعبدالرزاق (١٠١٧٧)

٢١١ - **ابن عباس** دەڵێ : سەربڕاوی ئەهلی کتاب دەخورێت ئەگەر بۆ غەیری الله ـش سەربڕدرا .

المصنف لعبدالرزاق (١٠١٧٨)

٢١٢ - **عطاء** دەڵێ : وتەی الله (وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ) واتە : بەناوی مەسیح هیچ کێشەیەک نیە لەسەربڕاوەکانیان . المصنف لعبدالرزاق (١٠١٨٠)

٢١٣ - **ابن وهب** دەڵێ : پرسیارم لە ابن زيد کرد دەربارەی سەربڕاوێک کە بۆ کەنیسەکان سەربڕدراوە و ناوی کەنیسەی لەسەر هێنراوە ئایە دەخورێت ؟ وتی : الله تعالى خواردنی ئەهلی کتاب ـی بۆ حەڵاڵ کردووین هیچ شتێکی جیانەکردۆتەوە . تفسير الطبري (١١٢٥٤)

٢١٤ - **هذيل بن بلال** دەڵێ : پرسیارم لە عطاء کرد دەربارەی سەربڕاوی مەسیحیەک کە بیستم وتی : بەناوی مەسیح ؟ عطاء وتی : بیخۆن . أحكام آهل الملل للخلال (١٠٤٢)

٢١٥ - **اسحاق بن منصور** دەڵێ : پرسیارم لە ئیمام احمد کرد دەربارەی سەربڕاوی گاورێک ناوی الله ـی لەسەر ناهێنێت ؟ وتی : کێشەی تێدانیە. مسائل الكوسج (٢٨٢٦)

**مەزهەبی سێ یەم : تا ئەوکاتەی بیستت ئینجا حەرامە**

٢١٦ - **بوخاری** دەڵێ : هیچ کێشەیەک لە سەربڕاوی نصاری العرب ـدا نیە بەڵام ئەگەر بیستت ناوی غەیری الله ـیان لەسەر هێنا مەیخۆن بەڵام ئەگەر نەتانبیست ئەوە الله بۆتانی حەڵاڵ کردووە وە کوفرەکەشیان دەزانێت . صحيح البخاري (حديث٩٢)

٢١٧ - **ابراهيم** دەڵێ : ئەگەر بیستت ناوی غەیری الله ـی لەسەر هێنرا درووست نیە بخورێت ئیللا لەوەی خۆت بدزیتەوە لەوەی ببیستیت ناوی غەیری الله ـش بریتیە لە بەناوی مەسیح . المصنف لعبدالرزاق (١٠١٨٨)

❊❊❊

**(سەربڕاوی اهل الکتاب کە بە ڕێگایەکی شەرعی سەرنەبڕدراوە)**

٢١٨ - **معمر** دەڵێ : پرسیارم لە قەتادە کرد دەربارەی پیاوێکی یەهودی مەڕێک سەردەبڕیت بەڵام هەڵەی لەسەر دەکات تا ئەوکاتەی حەڕام دەبێت ؟ وتی : درووست نیە بۆ موسڵمان بیخوات ئەگەر پیاوێک لە ئەهلی کتاب خواردنێکی لێ نزیک کردیەوە فەرمانی پێ بکە کە بیخوات ئەگەر لێی خوارد بیخۆ گەر نەیخوارد مەیخۆ . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٨٠)

٢١٩ - **قەتادە** دەڵێ : ئەگەر یەهودیەک مەڕێکی سەربڕی دینەی خراپ بوو لەسەری بۆ موسڵمان حەڵاڵ نیە بیخوات . المصنف لعبدالرزاق( ٨٥٨١)

❋❋❋

## ذبائح المشركين : سەربڕاوی هاوبەش دانەران

٢٢٠ - **قال الله** : حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَنْ تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ.

**الله تعالى** دەفەرمووێت : خواردنی گوشتی مردارەوە بوو و، هەرخوێنێ لەهەر ئەندامێکی حەیوان بێتە دەرێ و بڕوا، حەرامە بۆتان ئەی موسڵمانان! هەروەها گۆشتی بەرازیش بۆتان حەڕامر و هەر ئاژەڵێکیش کە لەوەختی سەربڕیندا ناوی غەیری خوای لێ بهێنرێ و ماڵاتی خنکاو و لێدراویی مردارەوە بووو هەڵدێراو و لە شاخ بەرەوە بوو و مردارەوەبوو لەشەڕە قۆچدا و هەرچی دڕندە پەلاماری دابێ و مردارەوە بووبێمەگەر بەر لەگیان دەرچوونی، فریای چەقۆ کەوتبێ و سەرتان بڕیبێ، واتە: ئەگەر هەریەک لەوانە پێش گیاندەرچوونی بەر دەسکەوت و سەر برا، خواردنی حەڵاڵ دەبێ وە هەرچی بۆ بتەکانیش سەربڕا حەرامە و هەرچیش لەسەر قوماری تیر دابەش دەکــرێ و، مەبـــەستەکانی پێ دیاری دەکرێ، قەدەغەو حەرامە. کردنی هەر کارێ لەوانە، لە سنوور دەرچوون و نافەرمانی خوایەو، تۆڵە دەدرێ.

### (وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُصُبِ)

**ئەوەی بۆ بتەکان سەردەبڕدرێن**

٢٢٢ - **ابن عباس** دەڵێ : وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ : بەردێکـ بوو موشریکان ئاژەڵیان بۆ سەر دەبڕی لە غەیری خوا . تفسير الطبري(١١٠٥٤)

٢٢٣ - **قەتادە** دەڵێ : وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ : واتە ئەو سەربڕاوانەی بۆ بتەکان سەردەبڕدران .

تفسير عبدالرزاق (٦٧٣) تفسير الطبري(١١٠٥٣)

٢٢٤ - **مجاهد** دەڵێ : وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ : بەردێک بوو لە دەوری کەعبە لەسەردەمی جاهلیەت ئاژەڵیان لەسەر سەردەبڕی بۆ بتەکان وە دەیان گۆڕی ئەگەر مەبەستیان بوایە وە ئەگەر بەدانەیەکی تر سەرسام بووبانە . تفسير مجاهد (صـ٣٠٠) تفسير الطبري (١١٠٤٩)

٢٢٥ - **الضحاك بن مزاحم** دەڵێ : وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ : بەردێک بوو سەربڕاویان لەسەر سەر دەبڕی بۆ بتەکانیان لە غەیری خوا . تفسير الطبري (١١٠٥٦)

٢٢٦ - **مقاتل بن سليمان** دەڵێ : وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ : نصب بەردێک بوو قورەیش بتەکانیان لەسەر دەپەرست پارێزەرانی کەعبە ئاژەڵیان بۆ ئەم بتە سەر دەبڕی لەسەر ئەم بەردە هەر کاتێک مەبەستیان بوایە ئەم بەردەیان دەگۆڕی بە بەردی تر بۆیە ئەم سەربڕاوە بە قەتعی حەڕامە. تفسير مقاتل بن سليمان (١/ ٤٥٢)

٢٢٧ - **محمد بن عمر** دەڵێ : کاتێ خبیب بەدیل گیرا لای قورەیش لەماڵی موهب مولى الحارث دانرا خێزانەکەی موهب بە خبیب ـی وت : هیچ پێویستیەکت هەیە ؟ لە وەڵامدا وتی : ئاوم پێنادەن ئیللا عەزاب نەبێ وە خواردنم پێنادەن ئیللا ئەوە نەبێت کە بۆ بتەکان سەردەبڕن هەواڵم پێبدەن گەر ویستتان بمکوژن

طبقات ابن سعد (٢/ ٤٣)

٢٢٨ - **ابن قتيبة** دەڵێ : هاوەڵی خۆشەویست خلف بن عبدالملك ناوی لێنرابوو أبي اللحم : باوکی گۆشت لەبەر ئەوەی ئەو گۆشتانەی نەدەخوارد کە موشریکانی قورەیش سەریان دەبڕی لەسەر ئەو بەردەی (النصب) بۆ بتەکانیان بۆیەش دەست هەڵگرتبوو لە گۆشت خواردن (لە دار الشرك)ـی مەککە.

المعارف لابن قتيبة(١/ ٢٢٣)

٢٢٩ - **عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا،** أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقِيَ زَيْدَ بْنَ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ بِأَسْفَلِ بَلْدَحٍ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْوَحْيُ، فَقُدِّمَتْ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُفْرَةٌ فِيهَا لَحْمٌ، فَأَبَى أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا، ثُمَّ قَالَ زَيْدٌ : إِنِّي لَسْتُ آكُلُ مِمَّا تَذْبَحُونَ عَلَى أَنْصَابِكُمْ، وَلَا آكُلُ إِلَّا مَا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ. وَأَنَّ زَيْدَ بْنَ عَمْرٍو كَانَ يَعِيبُ عَلَى قُرَيْشٍ ذَبَائِحَهُمْ، وَيَقُولُ : الشَّاةُ خَلَقَهَا اللَّهُ، وَأَنْزَلَ لَهَا مِنَ السَّمَاءِ الْمَاءَ، وَأَنْبَتَ لَهَا مِنَ الْأَرْضِ، ثُمَّ تَذْبَحُونَهَا عَلَى غَيْرِ اسْمِ اللَّهِ إِنْكَارًا لِذَلِكَ.

**ابن عمر** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گەیشت بە زيد بن عمرو بن نفيل لە خوار دۆڵی بلدح پێش ئەوەی وەحی دابەزێت بەسەر پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم قورەیش سفرەیان بۆ پێغەمبەر ڕاخست گۆشت لەسەر خواردەن و سفرەکە بوو پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەیخوارد بردیانە پێش زيد ئەویش نەی ویست کە لێی بخوات لە پاشاندا زەید وتی : من ئەو گۆشتە ناخۆم کە لەسەر ئەو بەردە بۆ بتەکان سەردەبڕدرێن وە ئەو گۆشتەش ناخۆم کە ناوی الله ـتان لەسەر نەبردوون . زيد سەربڕاوەکانی قورەیشی عەیبدار دەکرد و پێی دەوتن : مەڕێک الله درووستی کردووە وە الله تعالى لە ئاسمانەوە ئاوی بۆ دابەزاندووە وە گژ و گیای بۆ ڕواندووە بۆ لەوەڕیان لە پاشان دەچن سەری دەبڕن لەسەر غەیری ناوی الله تعالى . ئیتر زۆر ئینکاری لێدەکرد. مسند احمد(٥٣٦٩ - ٥٦٣١) صحيح البخاري(٣٨٢٦ - ٥٤٩٩)

**لێدوانـم :** ئەوەی لە فیقهی ئەم فەرموودەیەدا هاتووە ئەوەیە کە لە دار الشرك و دار الكفر ئەگەر چوویتە سەر سفرەی نانخواردن ئەو کەسانەی کە سفرەکەیان داناوە موشریک بووبن بەهۆی هەر جۆرە شیرکێک کە ئەنجامیان داوە جیاوازی نیە ئەوە درووست نیە بیخۆیت چوونکە حەڕامە نمونەش : کوردستان کە دار الکفر ـە ئەگەر سفرە دانرا لەلایەن کەسانێک کە بەهۆی شیرک و کوفرەوە کافر و موشریک بوونەتەوە جیاوازی نیە بە هاواربردن و گۆڕ پەرستی و شەخس پەرستنەوە موشریک بووبێتەوە یاخود بەهۆی وەلاء و خۆشەویستی و پشتگیری و سەرخستنی عەلمانیەت لێرەش : حیزبە بەناو ئیسلامیەکان و مدخلی و سۆفیەکانیش دەگرێتەوە کە موشریک و کافرن بەهۆی کوفر و شیرکێک کە تێکەڵی ئیمانیان بووە بۆیە ئاگەداربن فالله المستعان.

٢٣٠ - **زیدٍ بن حارثة** دەڵێ : لە ڕۆژێکی گەرمی شاری مەککەدا لەگەڵ پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم دەرچووین بۆلای بەردێک لەو بەردانەی کە قوڕەیش ئاژەڵەکانی لەسەر سەردەبڕی بۆ بتەکانیان مەڕێکمان لەوێ سەربڕی و گۆشتەکەمان پێچایەوە گەیشتین بە زید بن عمرو بن نفیل هەریەکەمان سڵاوێکی سەردەمی جاهلیمان لەیەک کرد پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە زید بن عمرو بن نفیل ـی وت : ئەی زەید دەبینم قەومەکەت ڕقیان لێت دەبێتەوە ؟ زەید وتی : سوێند بەخوا ئەی محمد ئەوە لەبەر ئەوەیە من **نائلة** ـەکەی ئەوان دەبوغزێنم (**نائلة** : بتێکی قوڕەیش بوو) بەڵام من دەرچووم لەپێناو ئەو دینە تا چووم بۆلای ئەحبارێکـی فدک بینیم الله دەپەرستێت بەڵام شیرکی بۆ ئەنجام دەدات وتم : دەبێ ئەم دینە کامە بێت کە دەمەوێت . ڕۆیشتم تا گەیشتم بە ئەحبارەکانی شام بینیم الله دەپەرستن بەڵام شیرک ئەنجام دەدەن وتم : دەبێ ئەم دینە کامە بێت کە دەمەوێت . شەیخێکـ لەوان پێی وتم : تۆ پرسیار لە دینێکـ دەکەیت هیچ یەکێکمان نەدیوە بیپەرستێت ئیللا شەیخێک نەبێت لە ناوچەی حیرە منیش هەستام چووم بۆلای ئەو شێخە کاتێ منی بینی پێی وتم : تۆ کێیت ؟ وتم : لە ئەهلی بەیت و ماڵی خوام ئەو شەیخە وتی : ئەو دینەی کە تۆ داوای دەکەیت لە وڵاتەکەت بەدیار دەکەوێت پێغەمبەرێکـی بۆ ڕەوانە دەکرێت چونکە بەڕاستی ئەستێرەکە هەڵاتووە وە هەموو ئەوانەی ئێستا لەسەر گومڕاین . ئەی محمد پاش ئەوە هەستم بە هیچ نەکرد زید بن حارثة دەڵێ : سفرەیەکی لێ نزیک کراوە زید بن عمرو بن نفیل وتی : ئەوە چیە ئەی محمد ؟ پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم وتی : مەڕێکە بۆ بەردێک لە بەردەکان سەرمان بڕیوە زید وتی : من شتێک ناخۆم کە ناوی الله ـی لەسەر نەبرابێت ... پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە زەیدی وت : تۆ لە قیامەت تەنها ئوممەتێکی زیندوو دەکرێیتەوە. مسند أبي يعلى(٧٢١٢)

٢٣١ - **سعید بن زید** دەڵێ : پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم تێپەڕی بەلای زید بن عمرو بم نفیل زید بن الحارثة ـەشی لەگەڵ بوو زید بن عمرو بانگ کرا بۆ سەر سفرەیەکـ بۆ خواردن زید وتی : ئەی کوڕی برام من نان لەسەر سفرەیەک ناخۆم کە بۆ بتەکان سەر بڕدرابێت.

مسند البزار(١٢٦٧) تاريخ الكبير لأبي خيثمة(٤٠٤٦) معرفة الصحابة لأبي نعيم(٥٥٠)

٢٣٢ - **قال ابن سعد** :زَيْدُ بْنُ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ يَطْلُبُ الدِّينَ،وَقَدِمَ الشَّامَ فَسَأَلَ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى عَنِ الْعِلْمِ وَالدِّينِ فَلَمْ يُعْجِبْهُ دِينُهُمْ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنَ النَّصَارَى: أَنْتَ تَلْتَمِسُ دِينَ إِبْرَاهِيمَ، فَقَالَ زَيْدٌ: وَمَا دِينُ إِبْرَاهِيمَ؟ قَالَ: كَانَ حَنِيفًا لَا يَعْبُدُ إِلَّا اللَّهَ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَكَانَ يُعَادِي مَنْ عَبَدَ مِنْ دُونِ اللَّهِ شَيْئًا، وَلَا يَأْكُلُ مَا ذُبِحَ عَلَى الْأَصْنَامِ، فَقَالَ زَيْدُ بْنُ عَمْرٍو: وَهَذَا الَّذِي أَعْرِفُ، وَأَنَا عَلَى هَذَا الدِّينِ، فَأَمَّا عِبَادَةُ حَجَرٍ أَوْ خَشَبَةٍ أَنْحِتُهَا بِيَدِيَّ فَهَذَا لَيْسَ بِشَيْءٍ، فَرَجَعَ زَيْدٌ إِلَى مَكَّةَ وَهُوَ عَلَى دِينِ إِبْرَاهِيمَ.

**ابن سعد** دەڵێ : زید بت عمرو بەدوای دیندا دەگەڕا چوو بۆ وڵاتی شام پرسیاری لە زاناکانی یەهود و گاورەکان دەکرد دەربارەی زانست ودین هیچ سەرسام نەبوو بە دینی ئەوان پیاوێک لە گاورەکان پێی وت : بگەڕێ بەدوای دینی ئیبڕاهیم زید وتی : دینی ئیبڕاهیم چیە ؟ کابرا وتی : دینێکە دوورە لە شیرک الله ناپەرستن ئیللا تەنها نەبێت وە هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار نادەن وە دژایەتی ئەو کەسەش دەکەن کە جگە لە الله شتێکی تر دەپەرستن وە ناخۆن لەوەی کە لەسەر بتەکان سەردەبڕدرێن زید وتی : ئەوە من دەزانم وە من لەسەر ئەم دینەم بەڵام پەرستنی دار و بەرد کە بەدەست درووستی دەکەن ئەوە هیچ نیە زید گەڕایەوە مەککە و لەسەر دینی ئیبڕاهیم بوو. الطبقات الكبرى لابن سعد(٣ /٣٧٩)

٢٣٣ - **عَامِر بْن رَبِيعَةَ قَالَ**: كَانَ زَيْدُ بْنُ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ يَطْلُبُ الدِّينَ وَكَرِهَ النَّصْرَانِيَّةَ وَالْيَهُودِيَّةَ، وَعِبَادَةَ الْأَوْثَانِ وَالْحِجَارَةِ، وَأَظْهَرَ خِلَافَ قَوْمِهِ وَاعْتِزَالَ آلِهَتِهِمْ وَمَا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُهُمْ، وَلَا يَأْكُلُ ذَبَائِحَهُمْ،

**عامر بن ربيعة** دەڵێ : زید بن عمرو بەدوای دینی (**تەوحید**)دا دەگەڕا ڕقی لە گاوریەت و یەهودیەت بوو وە ڕقی لە بت پەرستی و بەرد پەرستی بوو وە ئیزهاری پێچەوانەی قەومەکەی کردبوو وە دوورکەوتبووتەوە لە پەرستراوەکانیان وە لەوەشی کە باو و باپیرانیان دەیان پەرست وە سەربڕاوەکانیانی بەدەخوارد. الطبقات الكبرى لابن سعد(٣/ ٣٨٠)

٢٣٤ - **قَالَ زَيْد** :هَذِهِ قِبْلَةُ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ، لَا أَعْبُدُ حَجَرًا، وَلَا أُصَلِّي لَهُ، وَلَا أَذْبَحُ لَهُ، وَلَا آكُلُ مَا ذُبِحَ لَهُ

**زيد بن عمرو** دەڵێ : ئەوە ڕووگەی ئیبڕاهیم و ئیسماعیلە (بيت الله) بەرد ناپەرستم وە نوێژیشی بۆ ناکەم وە قوربانیشی بۆ ناکەم وە ئەو سەربڕاوەش ناخۆم کە بۆی سەربڕدراوە. الطبقات الكبرى لابن سعد(٣/ ٣٨٠)

٢٣٥ - **قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ**: وَأَمَّا زَيْدُ بْنُ عَمرو بن نُفَيْل فوقف، فلم يدخل يَهُودِيَّةٍ وَلَا نَصْرَانِيَّةٍ، وَفَارَقَ دِينَ قَوْمِهِ، فَاعْتَزَلَ الْأَوْثَانَ وَالْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَالذَّبَائِحَ الَّتِي تُذْبَح عَلَى الأوثان.

**ابن إسحاق** دەڵێ : زيد بن عمرو بن نفيل وەستابوو نە داخلی دینی یەهودیەت بوو نە گاوریەت وە جیابووبیەوە لە دینی قەومەکەی وە دوور کەوتبوویەوە لە بتەکان و خواردنی مردارەوەبوو و خوێن و ئەو سەربڕاوانەی کە لەسەر بتەکان سەردەبڕدران. سير إبن هشام(١/ ٢٠٨)

٢٣٦ - **البغوي** لە کتێبی(**شرح السنة**)ـدا دەروازەیەکی داناوە بەناوی (بابُ ذبيحةِ أهْلِ الشِّرْكِ وأهْلِ الْكِتابِ) لەژێریدا ڕیوایەتەکانی زيد بن عمرو بن نفيل دەهێنێت و لەکۆتایدا دەڵێت:

ذَبِيحَة أهل الشّرك وَالْمَجُوس، فَحَرَام .

سەربڕاوی ئەهلی شیرک و مەجوس حەڕامە. شرح السنة للبغوي(١١/ ٢٠٦)

٢٣٧ - **الطبري** دەڵێ : سەربڕاوی گشت ئەهلی شیرک و بت پەرستەکان وە هەرکەسێک دان بە تەوحیدی پەروەردگار نەنێت ئەوە حەڕامە لەسەرتان سەربڕاوەکانیان بخۆن. تفسير الطبري بتصرف قليل(٩/ ٥٧٢)

٢٣٨ - **عبد اللطيف بن عبد الرحمن آل الشيخ** دەڵێ : هەرکەسێک ئایەتی(فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ) بکاتە بەڵگە لەسەر سەربڕاوی موشریک و مورتەد ئەوە جاهیل ترین کەسە بە ئایەتی پەروەردگار و سوونەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و ئیجماعی ئوممەت موشریک ئەگەر ناوی الله ـشی هێنا لەسەر سەربڕاوەکە حەڕامە . ئەگەر کەسێک بڵێت : سەربڕاوی دەستی موشریک حەڵاڵە چونکە ناوی الله ـی لەسەر هێناوە ئەوە جاهیلە بە دین وە لاچووە لەسەر ڕێگای ئیمانداران. الدرر السنية في الأجوبة النجدية(٧/ ٤٨٤)

***

## ذبائح المرتد والزنديق : سەربڕاوی هەڵگەڕاوە و زەندیق

**سەربڕاوی دەستی مورتەد و زەندیق**

٢٣٩ - **أبي داود** دەڵێ : پرسیارم لە ئیمام احمد کرد ئایە سەربڕاوی مورتەد دەخورێت ؟ ئیمام وتی : نەخێر ، وە ئایە سەربڕاوی زەندیق دەخورێت ؟ ئیمام وتی : سەربڕاویان ناخورێت . مسائل أبي داود(١٦٢٩)

٢٤٠ - **إسحاق بن منصور** دەڵێ : پرسیارم لە ئیمام احمد کرد ئایە سەربڕاوی مورتەد دەخورێت ؟ ئیمام وتی : بە درووستی نازانم . مسائل الكوسج (٢٧٩٩)

٢٤١ - **إسحاق بن منصور** دەڵێ : وتم بە ئیمام احمد پرسیار لە سفیان بن عیینة کرا دەربارەی سەربڕاوی مورتەد ئەویش وتی : درووست نیە .

**ئیمام احمد** وتی : سفیان ڕاستی کرد چوونکە مورتەد جێگیر نابن لەسەر دین و دانی پێنانێن .

مسائل الكوسج (٢٨٤٦)

٢٤٢ - **إبن قدامة** دەڵێ : وَذَبِيحَةُ الْمُرْتَدِّ حَرَامٌ، وإنْ كانَتْ رِدَّتُهُ إلى دِينِ أَهْلِ الْكِتَابِ قولُ مالِكٍ، والشَّافِعِيّ..

سەربڕاوی مورتەد حەڕامە ئەگەرچی مورتەد بوونەوەکەی بۆ سەر دینی یەهود و نەسارا بێت ئەوەش وتەی ئیمانی مالیک و شافعیە . المغني (١٥٤١)

٢٤٣ - **إبن القطان الفاسي** دەڵێ : ئیجماع لەسەر ئەوەیە کە سەربڕاوی مورتەد حەڕامە لەسەر موسڵمانان ئیللا ئەوزاعی بە حەڵاڵی دەزانێت . الإقناع في مسائل الإجماع (١٨٢٠)

## (باسێک لە سەربڕاوی مورتەد)

ئەگەر مورتەد بوونەوەکەی بۆ سەر دینی یەهود و نەسارا بێت ئەوە سەربڕاوەکەی حەڵاڵە

٢٤٤ - **إسحاق بن منصور** دەڵێ : إنْ تَدَيَّنَ بدينِ أهلِ الكتابِ، حَلَّتْ ذبيحَتُه ولَنا، أنَّه كافرٌ، لا يُقَرُّ على دِينِه، فلم تَحِلَّ ذَبِيحَتُه، كالوَثَنِيِّ : ئەگەر بێتوو ئەو مورتەدە دینداری بە دینی یەهود و نەسارا بکات ئەوە سەربڕاوەکەی حەڵاڵە وە بۆ ئێمە کافرە ئەگەر دانی نەنا بە دینەکەی ئەوە سەربڕاوی حەڵاڵ نیە نمونەی : بت پەرستەکان . المغني (١٥٤١)

٢٤٥ - **إسحاق بن منصور** دەڵێ : ئەگەر کەسێک مورتەد بۆیەوە لە ئیسلام بۆ دینی نەسارا ئەوە خواردنی سەریراوی درووستە . مسائل الكوسج (٢٧٩٩)

٢٤٦ - **عبدالله بن الإمام أحمد** دەڵێ : باوکم وتی : هیچ کێشەیەک لە خواردنی سەربڕاوی مورتەدێک نیە گەر بێتوو مورتەد بێتەوە بۆسەر دینی یەهود و نەسارا جگە لە مەجوسی.الجامع لعلوم الإمام أحمد للخلال (١٢- ٧٧)

٢٤٧ - **ئیمامی مالیک** دەڵێ : ئەگەر موسڵمان بۆ هەر دینێک مورتەد بێتەوە سەربڕاوی ناخورێت .

تهذيب المدونة (١٠٧٧)



## ذبائح تارك الصلاة : سەربڕاوی نوێژنەکەر

**سەربڕاوی ئەو کەسەی نوێژ ناکات .**

نوێژنەکەر بە ئیجماع کافرە و مورتدە لای هاوەڵان وە ئەو ئیجماعەش سەلەف پێیوە پابەند بووە بۆیە سەر بڕاوی ناخورێت.

٢٤٨ - **عَنْ قَيْسِ بْنِ الرَّبِيعِ**، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ سَمِيعٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ وَالَانَ أَبِي عُرْوَةَ الْمُرَادِيِّ قَالَ: رَجَعْتُ إِلَى أَهْلِي فَوَجَدْتُ شَاةً لَنَا مَذْبُوحَةً، فَقُلْتُ لِأَهْلِي: مَا شَأْنُهَا؟ فَقَالُوا: خَشِينَا أَنْ تَمُوتَ قَالَ: وَفِي الدَّارِ غُلَامٌ لَنَا سَبِيٌّ لَمْ يَصَلِّ، فَذَبَحَهَا فَأَتَيْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ فَسَأَلْتُهُ؟ فَقَالَ: «**كُلُوهُ**»

واتە : **أبي عروة** دەڵێ : گەڕامەوە بۆلای خێزانەکەم بینیم لای ماڵەکەم مەڕێک سەر بڕدراوە وتم بە خێزانەکەم : چۆن سەر بڕدراوە ؟ وتیان : ترساین لەوەی بمرێت ئەویش وتی : لە ماڵەکەمان غولامێک هەیە نوێژ ناکات ئەو سەری بڕیوە چووم بۆلای ابن مسعود پرسیارم لێی کرد ؟ وتی : بیخۆن

المصنف لعبدالرزاق (٨٥٦٤)

**لێدوانم** : هۆکاری فەرمان کردنی ابن مسعود بە خواردنی ئەو ڕیوایەتەی تری ابن قدامة ـە کە دەڵێ:

٢٤٩ - **عن وَالانَ قال**: انْتَهَيْتُ إلى دَارِى، فوَجَدْتُ شَاةً مَذْبُوحَةً، فقلتُ: مَنْ ذَبَحَها؟ قالوا: غُلامُكَ. قلتُ: واللهِ إنَّ غُلَامِى لا يُصَلِّى، فقال النِّسْوَةُ: نحن عَلَّمْنَاه، يُسَمِّى، فرَجَعْتُ إلى ابنِ مسعودٍ، فسَألْتُه عن ذلك، فأمَرَنِى بأكْلِها.

واتە : **والان** دەڵێ : گەیشتمەوە ماڵەوە مەڕێکی سەربڕاوم بینی وتم : کێ ئەمەی سەر بڕیوە ؟ وتیان : غولامەکەت وتم : سوێند بە الله غولامەکەم نوێژ ناکات ئافرەتەکان وتیان : ئێمە فێرە نوێژمان کرد و بسم الله ــی کردووە منیش گەڕامەوە بۆلای ابن مسعود دەربارەی خواردنی ئەو مەڕە پرسیارم لێی کرد ئەویش فەرمانی خواردنی پێکردم . المغني (٣ / ٣٥٦)

٢٥٠ - **ابن حبيب المالكي** دەڵێ : سەربڕاوی ئەو کەسە ناخورێت کە وازی لە نوێژ هێناوە.

المنتقى شرح الموطأ (٣ /١١١)

٢٥١ - **القرافي** دەڵێ : سەربڕاوی ئەو عەجەمیەی نوێژ نازانێت درووست نیە خواردنی . الذخيرة (٤/ ٢١٧٠)

**کەواتە نوێژنەکەر سەربڕاوی حەڕامە و خواردنی حەڵاڵ نیە.**

❊❊❊

## الذبائح لغير الله : سەربڕاوەکان بۆ غەیری الله

### سەربڕاو بۆ غەیری الله تعالى

٢٥٢ - **الله تعالى** دەفرموویت: (حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَنْ تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ)

### ڕاڤەکردنی ئەم ئایەتە :

٢٥٣ - **أَبِي الْعَالِيَةِ** دەڵێ : وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ يعني: مَا ذُكِرَ عَلَيْهِ غَيْرُ اسْمِ اللَّهِ : ناوی غەیری الله تعالى ی لەسەر دێنن.

**وەک** : مەسیح و شێخ عبدالقادری گەیلانی و شێخ فلان و و جنۆکە .. هتد

تفسير إبن أبي حاتم (١٥١٨)

٢٥٤ - **مُجَاهِدٍ** دەڵێ : وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ يعني: مَا ذُبِحَ لِغَيْرِ اللَّهِ : بۆ غەیری الله سەری ببڕێت .

تفسير إبن أبي حاتم (١٥١٨)

٢٥٥ - **الْحَسَنِ** دەڵێ : وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ يعني: مَا ذُبِحَ لِغَيْرِ اللَّهِ : بۆ غەیری الله سەری ببڕێت .

تفسير إبن أبي حاتم (١٥١٨)

٢٥٦ - **قَتَادَةَ** دەڵێ : وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ يعني: مَا ذُبِحَ لِغَيْرِ اللَّهِ : بۆ غەیری الله سەری ببڕێت .

تفسير إبن أبي حاتم (١٥١٨)

٢٥٧ - **ضَحَّاكِ** دەڵێ : وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ يعني: مَا ذُبِحَ لِغَيْرِ اللَّهِ : بۆ غەیری الله سەری ببڕێت .

تفسير إبن أبي حاتم (١٥١٨)

٢٥٨ - **الزُّهْرِيِّ** دەڵێ : وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ يعني: مَا ذُبِحَ لِغَيْرِ اللَّهِ : بۆ غەیری الله سەری ببڕێت .

تفسير إبن أبي حاتم (١٥١٨)

٢٥٩ - **ابن عباس** دەڵێ : وما أهِلّ به لغير الله يعني : ما أهِلّ به للطواغيت وما ذبح لغير الله من أهل الكفر، غير اليهود والنصارى : بۆ تاغوتان سەربڕدراوە وە بۆ غەیری الله تعالى سەربڕدراوە لە ئەهلی کوفر غەیری یەهود و نەسارا . تفسير الطبري (٢٤٧١)

٢٦٠ - **ضَحَّاكِ** دەڵێ : وما أهِلّ به لغير الله يعني : ما أهِلّ به للطواغيت : بۆ تاغوتان سەربڕدراوە.

تفسير الطبري (٢٤٧٢)

٢٦١ - **عطاء** دەڵێ : وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ يعني: مَا ذُبِحَ لِغَيْرِ اللَّهِ : بۆ غەیری الله سەری ببڕێت .

تفسير الطبري (٢٤٧٣)

٢٦٢ - **ابن زيد** دەڵێ : وما أهلّ به لغير الله- يعني: ما يذبح لآلهتهم، الأنصابُ التي يعبدونها أو يسمُّون أسماءَها عليها. قال: يقولون:باسم فلان كما تقول أنت:باسم الله قال، فذلك قوله:وما أهلّ به لغير الله : بۆ پەرستراوەکانیان سەردەبڕی . ئەو بەردەی کە حەیوان بۆ بتەکان لەسەری سەردەبڕا و دەیان پەرست یان ناویان لەسەر ناولێدەنا دەیان وت : ئەم سەربڕاوە بە ناوی فلان سەردەبڕم وەک چۆن تۆ دەڵێی بە ناوی الله . **تفسير الطبري (٢٤٧٦)**

**ئیمامی نەسائی** لە "**سنن**"ـەکەیدا باب ـێکی داناوە بە ناوی (مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ) لە ژێریدا ئەم فەرموودەی هێناوە:

٢٦٣ - **پێغەمبەر** صلى الله عليه وسلم بە **ئیمامی عەلی** دەفەرموویت (لَعَنَ اللَّهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللَّهِ) واتە : نەفرەتی الله لەو کەسەی ئاژەڵ بۆ غەیری الله تعالى سەردەبڕێت. سنن النسائي (٤٤٢٢)مسند احمد (٨٥٥)السنة لعبدالله (١٢٥٣)

٢٦٤ - لە لەفزێکی **ئیمام ئەحمەد** هاتووە (مَلْعُونٌ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللَّهِ) واتە : نەفرەت لێکراوە ئەو کەسەی ئاژەڵ بۆ غەیری الله تعالى سەر دەبڕێت . مسند احمد (١٨٧٥)

٢٦٥ - **ابن سابط** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەفرەتی لە چوار شت کرد یەکێک لەوانە : سەربڕین بۆ غەیری الله تعالى . مصنف إبن أبي شيبة (٢٣٤٢١)

٢٦٦ - **البربهاري** دەڵێ : ولا نخرج أحدا من أهل القبلة من الإسلام حتى يرد آية من كتاب الله، أو يرد شيئا من آثار رسول الله صلى الله عليه وسلم، أو يذبح لغير الله، أو يصلي لغير الله، فإذا فعل شيئا من ذلك فقد وجب عليك أن تخرجه من الإسلام، وإذا لم يفعل شيئا من ذلك فهو مؤمن مسلم بالاسم لا بالحقيقة.

کەس لە ئیسلام نابەینە دەرەوە تا ئەوکاتەی ...بۆ غەیری الله تعالى سەر دەبڕیت...ئەوکات لەسەرت واجب دەبێت لە ئیسلام بیبەیتە دەرەوە و تەکفیری بکەیت . شرح السنة (٤١)

❋❋❋

**(باسێک لەسەر سەربڕاو بۆ غەیری الله)**

سەربڕاوەکانی یەهود و نەسارا ئەگەر بۆ غەیری الله تعالی ـش سەری ببڕن حەڵاڵە خواردنی:

٢٦٧ - **قَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ**: وَأَخْبَرَنِي مَنْ، سَمِعَ الْحَكَمَ بْنَ عُتَيْبَةَ يَقُولُ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى، عَنْ عَلِيٍّ، وَمُجَاهِدٍ : أَنَّهُ قِيلَ لَهُمَا: إِنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ يَذْكُرُونَ عَلَى ذَبَائِحِهِمْ غَيْرَ اللَّهِ، فقَالَا: إِنَّ اللَّهَ حِينَ أَحَلَّ ذَبَائِحَهُمْ عَلِمَ مَا يَقُولُونَ عَلَى ذَبَائِحِهِمْ

به **علی** و **مجاهد** وترا : ئەهلی کتاب لەسەر سەربڕاوەکانیان ناوی غەیری الله تعالی دەبەن هەردووکیان وتیان : الله تعالی ئەوکاتەی سەربڕاوەکانی حەڵاڵ کرد دەیزانی کە ئەوان چی لەسەر سەربڕاوەکانیان دەڵێن . المصنف لعبدالرزاق (١٠١٧٧)

٢٦٨ - **ابْنِ عَبَّاسٍ** دەڵێ : تُؤْكَلُ ذَبَائِحُ أَهْلِ الْكِتَابِ وَإِنْ ذُبِحَ لِغَيْرِ اللَّهِ»، أَوْ قَالَ: «وَإِنْ أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ» واتە : سەربڕاوی ئەهلی کتاب دەخورێت ئەگەرچی بۆ غەیری الله تعالی ـش سەربڕابێت . المصنف لعبدالرزاق (١٠١٧٨)

٢٦٩ - **عَطَاءٍ** دەڵێ : فِي قَوْلِهِ: {وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ} قَالَ: يَقُولُ: بِاسْمِ الْمَسِيحِ وَقَالَ: لَا بَأْسَ بِذَبَائِحِهِمْ واتە : نەسارا لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵەکانیان دەڵێن : بەناوی پێغەمبەر عیسا وە هیچ کێشەیەک لە سەربڕاوەکانیان نیە . المصنف لعبدالرزاق (١٠١٧٩)

٢٧٠ - **عَبْدُ الرَّزَّاقِ** دەڵێ : إِذَا ذَبَحَ النَّصْرَانِيُّ فَنَسِيَ أَنْ يُسْمِيَّ فَلَا بَأْسَ بِهِ، وَإِنْ سَمِعْتَهُ يُهِلُّ لِغَيْرِ اللَّهِ حِينَ ذَبَحَ فَإِنِّي أَكْرَهُهُ، وَكَانَ بَعْضُهُمْ يُرَخِّصُ فِي ذَلِكَ، وَأَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ لَا يَأْكُلَهُ.

واتە : ئەگەر نەسرانیەک ئاژەڵێکی سەربڕی لەبیری چوو ناوی الله بێنێت کێشەی تێدا نیە . وە ئەگەر ببیستم بۆ غەیری الله تعالی ـی سەربڕی وە ناوی غەیری الله ـی هێنا ئەوە من بە ناپەسەندی دەزانم هەندێک ئەوەیان ڕێگە پێداوە بەڵام لەم خۆشەویسترە کە نەخورێت . المصنف لعبدالرزاق (١٠١٨٣)

٢٧١ - **عَطَاءً** دەڵێ : وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ أَحَلَّهُ اللَّهُ؛ لِأَنَّهُ قَدْ عَلِمَ أَنَّهُمْ سَيَقُولُونَ هَذَا الْقَوْلَ .

واتە : ئەوەی بۆ غەیری الله تعالی ــ سەر دەبڕن لە یەهود و نەسارا الله حەڵاڵی کردووە لەبەر ئەوەی الله تعالی دەیزانی ئەوان ئەو قسەیە دەکەن . المصنف لعبدالرزاق (١٠١٨٤)

٢٧٢ - **إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِي** دەڵێ : أَنَّهُ كَانَ إِذَا سَمِعَهُ يُهِلُّ كَرِهَ أَنْ يَأْكُلَهُ، إِلَّا أَنْ يَتَوَارَى عَنْهُ حَتَّى لَا يَسْمَعَهُ قَالَ: وَإِهْلَالُهُ أَنْ يَقُولَ: بِاسْمِ الْمَسِيحِ.

واتە : ئەگەر بێتوو ببیستم ناوی غەیری الله تعالی ــ لەسەر دەبەن پێم ناپەسەند بووە بیخۆم ئیللا ئەوە نەبێت خۆم لێی لادابا تا ئەوەی نەیبیستم وە ناو بردنەکە بریتی بوو لەوەی دەیان وت : بەناوی مەسیح

المصنف لعبدالرزاق (١٠١٨٥)

٢٧٣ - **مَيْمُونٍ بن مِهْرَان** دەڵێ : قەومێک لە نەسڕانیەکان لە شام مەڕیان سەر دەبڕی و دەهاتن لەناو موسڵمانان دەیان فرۆشت بۆیە عمر بن عبدالعزیز موسڵمانانێکی کردبووە وەکیلی خۆی لەوەی کە بچن ئامادەی سەربڕینەکە بن لە شام بۆ ئەوەی ئامادەبن لەوەی ئەگەر سەریان بڕی ناوی الله بێنن وە ڕێگری لەوە بکەن کە شیرک لە سەربڕینەکانیان بکەن . المصنف لعبدالرزاق (١٠١٨٦)

٢٧٤ - **قَتَادَةَ** دەڵێ : إِذَا قَدَّمَ إِلَيْكَ الْيَهُودِيُّ طَعَامًا، فَأْمُرْهُ أَنْ يَأْكُلَ مِنْهُ، فَإِنْ أَكَلَ فَكُلْ، وَإِنْ أَبَى فَلَا تَأْكُلْ مِنْهُ

واتە :ئەگەر یەهودیەک خواردنی پێشکەش کردی فەرمانی پێبکە کە لەوخواردنە بخۆ ئەگەر خواردی ئەوە تۆش بیخۆ وە ئەگەر نەیخوارد تۆش مەخۆ. المصنف لعبدالرزاق (١٠١٨٧)

**لێدوانم** : لەبەر دوو هۆکار:

١ - ئەوان ناوی غەیری الله تعالی ناهێنن ئەگەر خواردی ئەوە ناوی الله ــ هێناوە تۆش بیخۆ وە ئەگەر نەیخوارد تۆش مەیخۆ چوونکە پێی حەڵاڵ نیە.

٢ - بۆ بابەتی ژەهر دەرد‌خواردن کە پیشەی یەهود بووە .

٢٧٥ - **قَتَادَةَ** دەڵێ : پیاوێکی نەسرانی مەڕێک سەر دەبڕێت بۆ دین و میللەتێک نیەتی تێیدا هەڵە دەکات تا ئەوەی لەسەری حەرام دەبێت خواردنی ئەوکات بەهەمان شیوە لەسەر موسڵمانیش حەرام دەبێت بیخوات . المصنف لعبدالرزاق (١٠١٨٨)

٢٧٦ - **عِكْرِمَةَ** دەربارەی سەربڕاوی موسڵمان و یەهودی و نەسارا دەڵێ : ئەو بۆتۆ ئاژەڵ سەرنابڕێت بەڵکو تۆ سەری دەبڕیت لەبەر ئەوەی دینی ئێمە زاڵترە بەسەر دینیان مَعْمَرٌ دەڵێ : پرسیارم لە زوهری کرد دەربارەی ئەم باسە ؟ وتی : کێشەی نیە هەر یەکێکیان سەری ببڕیت بەڵام ئەگەر بیستان ناوی غەیری الله تعالی ـیان لەسەر برد مەیخۆن ناوبردنەکەش دەڵێن : بەناوی مەسیح . المصنف لعبدالرزاق (١٠١٩٠)

(**وَالْمُنْخَنِقَةُ**) خواردنی مەڕ و ماڵاتی خنکاو بە ئیجماع حەرامە.

(**وَالْمَوْقُوذَةُ**) مەڕ و ماڵاتی لێدراو و دواتر مرداربوون بە ئیجماع خواردنی حەرامە .

(**وَالْمُتَرَدِّيَةُ**) مەڕ و ماڵاتی هەڵدێردراو لە شاخ و مردنی بە ئیجماع خواردنی حەرامە .

(**وَالنَّطِيحَةُ**) وە ئەو مەڕ و ماڵاتەی لەشەڕە قۆچدا دەمرن بە ئیجماع خواردنیان حەرامە .

(**وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ**) هەرچیەک دڕندە پەلاماری دابێت و مردبێت بە ئیجماع خواردنی حەرامە ئیللا ئەوە نەبێت پێش مردنی بە چەقۆ ڕابگەیت و سەری ببڕیت.

(**وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ**) وەهەرچیەک بۆ بتەکانیش سەربڕدران بە ئیجماع خواردنی حەرامە.

( **وَأَنْ تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ**) وە هەرچیەکیش لەسەر قوماری تیر هاوێشتن دابەش دەکرێت بە ئیجماع خواردنی حەرامە.

***

## ذبائح الجن : (سەربڕاو بۆ جنۆکەکان)

### سەربڕین بۆ جنۆکەکان

٢٧٧ - **ابن منظور** دەربارەی سەربڕاو بۆ جنۆکەکان دەڵێ : لە ژێر باب ــ (ذَبائحُ الْجِنِّ) لە عادەتی عەرەب وابوو پیاوێک خانووەکی دەکڕی یان ئاوی کانیەکی دەردەهێنا یان کاتێ تازە خانوویەکی دروست دەکرد و هاوشێوەی ئەوانە سەربڕاوێکی بۆ سەر دەبڕی بۆ لابردنی شووم لەسەریان وە لە ترسی ئەوەی جنۆکەکان زیانیان پێ بگەیەنن بۆیە لە ترسی جنۆکەکان سەری ئاژەڵیان سەر دەبڕی چوونکە دەترسان لەوەی ئەگەر سەربڕاو سەر نەبڕن یان خواردن نەدەن ئەوە جنۆکەکان ئازاریان پێ دەگەیەنن.

لسان العرب (٢ /٤٣٧)

٢٧٨ - **أبو عبيد الهروي** دەڵێ : پیاو دەچوو خانووەکی دەکڕی یان بیرێکی لێدەدا سەربڕاوێکی بۆ سەر دەبڕی بۆ لابردنی شوومی ئەم کارەیان دەکرد لە ترسی  ئەوەی کە جنۆکەکان ئازاریان نەدەن .

الغريبين في القرآن والحديث (٢ / ٦٧١)

٢٧٩ - **إبن الأثير** دەڵێ : پیاوێک خانوویەکی دروست دەکرد کاتێ تەواو دەبوو لە درووست کردن سەربڕاوێکی سەر دەبڕی وە دەیان گۆت : ئەگەر ئەو کارە بکەین ئەوە جنۆکەکان زیان بەو ماڵە ناگەیەنن.

النهاية في الغريب الحديث والأثر (١ /٣٠٧)

٢٨٠ - **عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ** دەڵێ : عیبادەت بۆ غەیری الله تعالى کوفرەکەی گەورەترە لە پشت بەستن بە غەیری الله تعالى لەسەر ئەمە ئەگەر سەربڕاو سەر ببڕیت بۆ غەیری الله تعالى وەک خۆ نزیک کردنەوە لە الله ئەوە حەرامە ئەگەر بێتوو بسم الله ـشی لەسەر بخوێنیت وەک گرووپێک لە موونافیقانی لەم ئوممەتە دەیکەن کە بە ئەستێرەکان و دوکەڵی بخور خۆیان لە الله نزیک دەکەنەوە ئەگەرچی ئەوانە مورتەدن لەهەرحاڵێک بن سەربڕاویان ناخورێت بەڵام لە سەربڕاوەکانیان دوو ڕێگری دروست دەبێت :

**یەکەم** : ئەوەیە بۆ غەیری الله سەریان دەبڕن **دووهەم** : وە سەربڕاوی موڕتەدن لەژێر ئەو باب ـە : خەڵکانێکی جاهیل لە سەردەمی جاهلیەت لە مەککە بۆ جنۆکەکان ئاژەڵیان سەر دەبڕی.

الدرر السنية في الأجوبة النجدية(٧/ ٤٨٤)

❋❋❋

## (سەربڕاوی ڕیا بازان و خۆهەڵکێشان)

٢٨١ - **ابْن عَبَّاس** دەڵێ : نەخۆن لەوەی دەشتەکیەکان سەریان دەبڕی بۆ خۆ هەڵکێشان چونکە من ئەمین نیم لەوەی بۆ غەیری الله تعالى سەرنەبڕابێت . غريب الحديث لابن قتيبة (٢/ ٣٥٩)

٢٨٢ - **ابن قتيبة** دەڵێ : ابن عباس نەهی دەکات لە خواردنی سەربڕاوێک کە بۆ ڕوپامایی و خۆ هەڵکێشان سەربڕابێت وە ئەوەش بۆ غەیری الله تعالى ـیە واتە مەبەست پێی کەسێکی تر .غريب الحديث لابن قتيبة (٢/ ٣٥٩)

❋❋❋

## ذبائح الشعراء والقمار : (سەربڕاوی شاعیران و قومارچیان)

٢٨٣ - **عِكْرِمَةَ** دەڵێ : لَا تُؤْكَلْ ذَبِيحَةٌ ذَبَحَهَا الشُّعَرَاءُ فَخْرًا، وَلَا ذَبِيحَةُ قُمَارٍ .

واتە : سەربڕاوی شاعیران کە وەک شانازی سەری دەبڕن ناخورێت وە سەربڕاوی قومارچیان ناخورێت.

المصنف لعبدالرزاق (٨٥٤٣)



## ذبائح الأمراء : (سەربڕاو بۆ هاتنی پادشا و دەسەڵاتداران)

٢٨٤ - **ابْنُ عَبَّاسٍ** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە لە خواردنی ئەو کەسانەی کە فەخر دەکەن و دەیانەوێت بەسەر یەکتر زاڵ بن. التاريخ الكبير للبخاري (١٧٧٥) سنن أبي داود (٣٧٥٤)

٢٨٥ - **البغوي** دەڵێ : هەندێک لە زانایان دەعوەت کران بەڵام نەچوون بۆ دەعوەتەکە پێیان وترا : سەلەف کاتێ بانگ دەکران وەڵامی دەعوەتەکەیان دەدایەوە دەیان وت : ئەوان بانگ دەکران بۆ برایەتی و تامەزرۆیی یەکتری بەڵام ئێوە ئەمڕۆ بۆ خۆ هەڵکێشان دەیکەن

٢٨٦ - وە دەڵێ : ڕیوایەت کراوە کە ئیمامی عومەر و عوسمان بۆ خواردنێک دەعوەت کرابوون کاتێ هاتنەوە ئیمامی عومەر بە ئیمام عوسمانی وت : چووین بۆ خواردنێک حەزم کرد ئامادەی نەبواین مەگەر وانیە ؟ ئیمام عوسمان وتی : دەترسێم ئەم خواردنە بۆ خۆ هەڵکێشان ئامادەکرابێت

شرح السنة للبغوي (٩ /١٤٤)

## ذبائح المجوس : (سەربڕاوی مەجوس)

٢٨٧ - **حسن بن محمد** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نامەیەکی نووسی بۆ مەجوسی هەجەر ئیسلامی نیشاندان و بانگی کردن بۆی هەرکەسێ موسڵمان بێت لێی قەبوڵ دەکرێت وەئەگەر بێتوو نەیانەوێت دەبێت جزیە بدەن لەسەر ئەوەش کە نابێت سەربڕاویان بخورێت وە ئافرەتیشیان لێ مارە ناکرێت . مسائل صالح (٦٣١)

٢٨٨ - **عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي لَيْلَى** دەڵێ : مەجوس ئەگەر ناوی الله ـش لەسەر ئاژەڵەکە بێنن سەربڕاوەکەیان ناخورێت . المصنف لعبدالرزاق(٨٥٤٥)

٢٨٩ - **ابْنِ عَبَّاسٍ** دەڵێ : ئەگەر مەجوسی ناوی الله ـشی لەسەر سەربڕاوەکە هێنا ناخورێت

المصنف لعبدالرزاق(٨٥٤٨)

٢٩٠ - **سعيد بن جبير** دەڵێ : مەجوس سەربڕاویان بۆ ئێمە حەڵاڵ نیە . المصنف لابن أبي شيبة(٢٤٤١٨)

٢٩١ - **أبو داود** دەڵێ : پرسیار لە ئیمامی ئەحمەد کرا دەربارەی سەربڕاوی مەجوسی ئایە دەخورێت ؟ ئیمام وتی : نەخێر سەربڕاویان ناخورێت. مسائل أبي داود (١٦٢٩)

٢٩٢ - **ابن هانئ** دەڵێ : بیستم لە ئیمام ئەحمەد پرسیاری سەربڕاوی مەجوسی لێکرا کە ئایە سەربڕاویان دەخورێت ؟ ئیمام وتی : ئافرەتیان لێ مارە ناکرێت وە نە سەربڕاویان دەخورێت . مسائل ابن هانئ (١٧٤٢)

٢٩٣ - **عبدالله بن الإمام أحمد** دەڵێ : پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی سەربڕاوی مەجوسی ؟ لە وەڵامدا وتی : سەربڕاویان ناخورێت . مسائل عبد اللَّه (٩٧٨)

٢٩٤ - **عبدالله** دەڵێ : بیستم لە باوکم ئیمام ئەحمەد دەربارەی سەربڕاوی مەجوسی وتی : ئافرەتیان لێ مارە ناکرێت وە نە سەربڕاویان دەخورێت تاوەکو موسڵمان دەبن وتم بە باوکم : ئەی دەربارەی وتەی ئیمام عومەر چی دەڵێن کە دەڵێ (سنوا بهم سنة أهل الكتاب) ؟ باوکم وتی : ئەوە دەربارەی جزیە دانە بەڵام سەربڕاویان شەش کەس لە هاوەڵان بە درووستی نازانن ئەوانیش : ابن عباس ، وابن مسعود ، وعن عبد اللَّه بن يزيد الخطمي . وعن علي، وجابر بن عبد اللَّه، وعن أبي برزة . مسائل عبد اللَّه(٩٧٩)

٢٩٥ - **خەلال** دەڵێ : المروذي هەواڵی پێدام کە باوکی عبدالله ئیمام ئەحمەد دەڵێ : لێرە کەسانێک هەن وای دەبینن کە سەربڕاوی مەجوس هیچ کێشەیەکی تێدانیە وتەی ابی ثور و سعید بن المسیب دەکەنە بەڵگە بەڵام ئەوەی ڕاستە سعید بن السیب پێچەوانە قسە دەکات کە پێی درووست نیە خەڵک تەنها دەربارەی ڕاوی مەجوسی ڕاجیاوازیان هەیە بەڵام دەربارەی سەربڕاویان هیچ نەمزانیوە ڕاجیاوازی هەبێت . الجامع لعلوم الإمام أحمد (١٢/ ٤٨١)

٢٩٦ - **خەلال** دەڵێ : ئیمام ئەحمد کاتێ لای ئەوان وتیان : سەربڕاوی مەجوس دەخورێت تورە بوو و وتی : ئەوە قسەی خراپە ئیمامی عەلی نصاری بن تغلب ــی بە ئەهلی کیتاب نەدەزانی چ جای مەجوس؟

الجامع لعلوم الإمام أحمد (١٢/ ٤٨١)

٢٩٧ - **خطاب بن بشر** دەڵێ : پرسیارم لە ئیمام ئەحمەد کرد دەربارەی زەواج لەگەڵ مەجوس ؟ لە وەڵامدا وتی : لە هیچ یەکێک لە زانایانم نەبیستووە پێیان درووست بێت نە سەربڕاویان حەڵاڵە نە زەواجیان.

الجامع لعلوم الإمام أحمد (١٢/ ٤٨١)

٢٩٨ - **عبد الملك بن عبد الحميد** دەڵێ : ئیمامی ئەحمەد دەڵێ : مەجوس سەربڕاویان ناخورێت هیچ یەکێکم نەبینیوە پێچەوانەی ئەوە بڵێن ئیللا بیدعەچی نەبێت. الجامع لعلوم الإمام أحمد (١٢/ ٤٨١)

٢٩٩ - **حنبل** دەڵێ : **ئیمام ئەحمەد** دەڵێ : مەجوس سەربڕاوی ناخورێت ئەگەر بسم الله ـشی لەسەر بکات . أحكام أهل الملل للخلال (١٠٥٣)

٣٠٠ - **عبد الملك الميموني** دەڵێ : **ئیمام ئەحمەد** دەڵێ : مەجوس ئەهلی کتاب نیە وە سەربڕاویان ناخورێت . أحكام أهل الملل للخلال (١١٣٨ - ١١٣٩)

٣٠١ - **حنبل** دەڵێ : پرسیار لە ئیمام ئەحمەد کرا دەربارەی نان خواردن لە ماڵی مەجوسی ؟ وتی : ڕاوی مەجوسی و سەربڕاوی ناخورێت . العدة في أصول الفقه(٢/ ٢٥٠)

٣٠٢ - **البغوي** دەڵێ : یەک دەنگی هەیە لەسەر حەڕامیەتی زەوجی مەجوسی و وە حەڕامیەتی سەربڕاویان . شرح السنة(١١/ ١٧٠)

٣٠٣ - **ابن المنذر** دەڵێ : ئیجماع لەسەر ئەوەیە کە سەربڕاوی مەجوس حەڕامە خواردنی . الإجماع لابن المنذر(٢٢٥)

**باسێک** : کەسێک لە نێوان پیاو و ئافرەتێک لە یەهودی و مەجوسی یاخود گاور و مەجوسیەک لەدایک بێت ئایە حوکمی سەربڕاوی چیە ؟

٣٠٤ - **ئیمامی مالیک** دەڵێ : مناڵ تابع ـە بۆ باوک ئەگەر باوکی گاوربوو و دایکی مەجوسی ئەوە سەربڕاوی دەخورێت . المدونة(١/ ٥٣٦)

٣٠٥ - **ئیمامی شافعی** دەڵێ : سەربڕاوی ناخورێت . كتاب الإم للشافعي(٢/ ٢٥٦)

٣٠٦ - **ابن القطان الفاسي** دەڵێ : ئیجماع لەسەر ئەوەیە کە سەربڕاوی مناڵێکی ئەهلی کتاب ئەگەر شارەزابێت بە سەربڕین حەڵاڵە ئەگەر بێتوو باوکی ئەهلی کتاب و دایکی مەجوسی بێت ئیللا شافعی نەبێت کە بەدرووستی نازانێت. الإقناع في مسائل الإجماع(١٨١٥)



## سەربڕاوی موشریکە نبطي (ئارامیەکان) و فارسەکان

٣٠٧ - **ابن مسعود** دەڵێ : ئەگەر لەزەویەک دابەزین موسڵمانانی لێنەبوون ئیللا نبطي و فارسیەکان نەبێت ئەگەر گۆشتان لێ کڕین پرسیار بکەن ئەگەر یەهودی و گاور سەریان بڕیبێت بیانخۆن وە ئەگەر مەجوسی سەریان بڕیبن مەیانخۆن . المصنف لابن أبي شيبة(٣٢٦٩٣) المصنف لعبدالرزاق(٨٥٧٦)

**لێدوانم : النبط** یان **النبيط** وشەیەکە عەرەب بە خەڵکانێک دەڵێن کە لە جنوبی عێراق دەژین وە بە زمانی ئارامی قسە دەکەن دواتر بە سریانیەکان ناویان دەرکرد.



## سەربڕاوی صابئة (ئەستێرە پەرستەکان یان فریشتە پەرستەکان)

٣٠٨ - **الله تعالى** دەفەرموویت (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئِينَ وَالنَّصَارَى وَالْمَجُوسَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا إِنَّ اللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) الحج:١٧

واتە :، بێگومان ئەو کەسانەی کە بڕوایان هێناوە ئەوانەش بوونە جوولەکەو شوێنکەوتەی موسا و ئەوانەش (سابییی)ین و لایان داوەو ئەستێرە یا فریشتە پەرستن و ئەوانەش شوێنکەوتەی عیسان و مەسیحین و ئەوانەش زەردەشتیی و ئاگرپەرستن و ئەوانەش کە هاوبەشیان بۆ خوا دانا بێگومان خوای هەق لە ڕۆژی دوایی و سەڵادا، بەکاری هەمووان ڕادەگاو داوەرییان دەکا بڕوادارەکانیان دەنێرێ بۆ بەهەشت و، ئەوانی تریش دەنێرێ بۆ دۆزەخ. بەڕاستیی خوا بەسەر هەموو شتێکدا شایەدو ئاگادارەو دەزانێ چی دەکەن، کەواتە ئەوانە هەرچی دەکەن، با بیکەن لەخوا شاراوە نابێ .

(**وَالصَّابِئِينَ**)

٣٠٩ - **الطبري** لە پێناسەیدا دەڵێ : لصابئون جەمعی صابئ ـە بەواتە دەوترێت کە لە دینێک درووست دەبن و زیاد دەبن بەسەری وەک پێگەی موڕتەدن لە ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە هەرکەسێک لە دینەکەی دەرچێت عەرەب پێی دەڵێت : صابئ أي خارج. تفسير الطبري (٢/ ١٤٥)

٣١٠ - **سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ** دەڵێ : الصابئين : پێگەیەکە لە نێوان یەهود و گاورەکان . تفسير ابن أبي حاتم(٦٣٧)

٣١١ - **مجاهد و عطاء** دەڵێن : الصابئة : کەسانێکن لەنێوان مەجوس و ئەهلی کتاب هیچ دینێکیان نیە

تفسير ابن أبي حاتم(٦٣٨)

٣١٢ - **أَبِي الْعَالِيَةِ و الضَّحَّاكِ وَالسُّدِّيِّ وَالرَّبِيعِ بْنِ أَنَسٍ وَجَابِرِ بن زيد** دەڵێن : الصابئين : گرووپێکن لە ئەهلی کتاب زەبوری داود دەخوێننەوە . تفسير ابن أبي حاتم(٦٣٨)

٣١٣ - **الْحَسَنِ** دەڵێ : الصابئة وەک مەجوسن. تفسير ابن أبي حاتم(٦٤٠)

٣١٤ - **أَبِي الزِّنَادِ** دەڵێ : صابئة قەومێکن لە عێراق دەژین بڕوایان بە هەموو پێغەمبەران هەیە وە لە ساڵێکدا یەک مانگ سی ڕۆژ بەڕۆژوو دەبن پێنج فەرزە نوێژ دەکەن و ڕوودەکەنە یەمەن.

تفسير ابن أبي حاتم(٦٤١)

٣١٥ - **أَبُو جَعْفَرٍ الرَّازِيُّ** دەڵێ : الصابئين قەومێکن فریشتەکان دەپەرستن وە زەبوری داود دەخوێننەوە و نوێژ دەکەن بەرەو قیبلە . تفسير ابن أبي حاتم(٦٤٢)

**لێدوانم** : بەهۆی ڕاجیاوازی لەوەی کە ئەهلی کتابن یاخود لەنێوان ئەوان و مەجوسدان بۆیە خیلاف درووست بووە لەسەر ئەوەی کە ئایە سەربڕاویان دەخورێت یان نا بەڵام لێرە چەند بەڵگەیەک هەن ئەوانیش:

٣١٦ - **ابن عباس** دەڵێ : قەومێکن لەنێوان یەهود و مەجوس ئافرەتەکانیان حەڵاڵ نین وە سەربڕاوەکانیان ناخورێت . الإشراف لابن المنذر (٣/ ٤٤٠)

٣١٧ - **حسن** دەڵێ : سەربڕاو و ئافرەتەکانیان مکروهن . المصنف لابن أبي شيبة(١٧٤٠٢)

٣١٨ - **ئیمامی شافعی** دەڵێ : ئەگەر صابیئیەکان و سامریەکان لە نەوەی ئیسڕائیل بن وە دینداری بکەن بە دینی یەهود و گاورەکان چونکە لە بنچینەی تەورات و ئینجیل ئافرەتیان و سەربڕاویان حەڵاڵە ئەگەرچی بێتوو پێچەوانەش بن لە ڕێچکەیەکی دینەکەیاندا بەڵام بێتوو پێچەوانەبن لە بنچینەیەک لە بنچینەکانی تەورات و ئینجیل نە سەربڕاویان حەڵاڵە نە ئافرەتیان. لأم للشافعي (٤/ ١٩٣)

٣١٩ - **إسحاق بن منصور** دەڵێ : پرسیارم لە ئیمام احمد کرد دەربارەی سەربڕاوی صابیئەکان ؟ وتی : ئەگەر لەسەر مەزهەبی ئیمامی عەلی بێت دەربارەی نصاری بن تغلب ئەوە درووست نیە بخورێت

٣٢٠ - **إسحاق** وتی : سەربڕاوی صابئین خواردنی کێشەی نیە چونکە گرووپێکن لە ئەهلی کتاب.

مسائل الكوسج(٢٧٩٧)

٣٢١ - **صالح بن الإمام احمد** دەڵێ : بە باوکم وت : چی دەڵێی دەربارەی سەربڕاوی صابئین؟ لە وەڵامدا وتی : ئەگەر بچین بۆسەر مەزهەبی ئیمامی عومەر کە ئەوانیش ڕۆژی شەممە دەکەن بۆیە لەجێگای یەهودن بۆیە خواردنی کێشەی نیە. أحكام أهل الملل للخلال (١٠١٣)

٣٢٢ - **حنبل** دەڵێ : وتم بە باوکی عبدالله باسی صابئین چیە ؟ لەوەڵامدا وتی : جۆرێکن لە گاورەکان ئەگەر کتاب ـێکیان هەبێت ئەوە سەربڕاوەکانیان دەخورێت . أحكام أهل الملل للخلال (١٠١٥ - ١٠١٨)

٣٢٤ - **ابن المنذر** دەڵێ : ئیجماع لەسەر ئەوەیە خواردنی سەربڕاوی صابیئیەکان درووست نیە .

الإقناع في مسائل الإجماع (٣٨٧)

❋❋❋

## (سەربڕاوی سامریەکان)

٣٢٥ - **عضيف بن الحارث** دەڵێ : نامەیەکیان نووسی بۆ ئیمام عومەر تێیدا وترابوو : ئێمە گەیشتین بە خەڵکانێکـ پێیان دەوترێت سامریەکان تەورات دەخوێننەوە وەک یەهود شەممانەیان هەیە وە بڕوایان بە ڕۆژی زیندووبوونەوە نیە ئەی ئەمیری ئیمانداران چی دەڵێی دەربارەی خواردنی سەربڕاوەکانیان ؟ ئیمام بۆیانی نوسیەوە تێیدا وتی : ئەوانە گروپێکن لە ئەهلی کتاب سەربڕاوەکانیان وەک سەربڕاوی ئەهلی کتاب ـن . المصنف لعبدالرزاق (٨٥٧٦) النوادر والزيادات (٣ /٣٥٧)

٣٢٦ - **عَمْرِو بْنِ شَرَاحِيلَ** دەڵێ : عمر بن عبدالعزيز نامەیەکی نووسی تێیدا وتی : هیچ کێشەیەکـ نیە لە خواردنی سەربڕاوی سامریەکان . الطبقات لابن سعد (٥ /٣٥٣)

٣٢٧ - **ئیمامی شافعی** دەڵێ : ئەگەر صابیئیەکان و سامریەکان لە نەوەی ئیسرائیل بن وە دینداری بکەن بە دینی یەهود و گاورەکان چونکە لە بنچینەی تەورات و ئینجیل ئافرەتیان و سەربڕاویان حەڵاڵە ئەگەرچی بێتوو پێچەوانەش بن لە ڕێچکەیەکی دینەکەیاندا بەڵام بێتوو پێچەوانەبن لە بنچینەیەکـ لە بنچینەکانی تەورات و ئینجیل نە سەربڕاویان حەڵاڵە نە ئافرەتیان. لأم للشافعي (٤/ ١٩٣)

٣٢٨ - **مهنا** دەڵێ : پرسیارم لە ئیمام احمد کرد دەربارەی سەربڕاوی سامریەکان ؟ ئیمام وتی : سەربڕاویان دەخورێت چونکە لە ئەهلی کتاب ـن . أحكام أهل الملل للخلال (٢/ ٤٣٩)

❋❋❋

## (سەربڕاوی جەهمیەکان)

٣٢٩ - **ئیمامی احمد** دەڵێ : (دوای باس کردنی جۆرەکانی جەهمیەت) دواتر وتی : هەموو ئەوانە جەهمی کافرن داوای تەوبەیان لێدەکرێت ئەگەر تەوبەیان نەکرد دەکوژرێن ئیجماعی لەسەرە لەوەی کە پێی گەیشتین لە ئەهلی علم ئەگەر هەرکەسێک ئەوە وتەی بێت و تەوبە نەکات ژنی لێ مارە ناکرێت وە سەربڕاوەکانیان ناخورێت . طبقات الحنابلة (٢/ ٤٢٦)

٣٣٠ - **إسحاق بن أبي عمرو** دەڵێ : بە وكيع ـيان رحمه الله ووت : سەربڕاوی جەهمیەکان؟

ووتی : سەربڕوای دەستیان ناخورێت، ئەوان لەدین هەڵگەراونەتەوە.

کتاب السنة عبد الله لعبدالله (٣٨)

٣٣١ - **بوخاری** دەڵێ : گوێ نادەم نوێژ لە پشت جەهمی و ڕافیزی بکەم یان لە پشت یەهودی و گاور سەلامیان لێ ناکرێت وە سەردانیشیان ناکرێت کاتێ نەخۆش دەکەون وە شایەتیشیان قبوڵ نیە وە ئافرەتیشیان لێ حەڵاڵ نیە وە سەربڕاوەکانیشیان ناخورێت . خلق أفعال العباد للبخاري (٣٤)

**لێدوانم** : واتە ئیجماعی لەسەرە کە سەربڕاوی جەهمی ناخورێت چونکە کافرن لەم بەشە معتزیلیەکانیش دەچێتە ژێریەوە بەتایبەت ئەوانەی دەیان وت : قورئان مخلوقە.

***

## سەربڕاوی ئەو کەسانەی دەیان وت : (قورئان مخلوقە)

٣٣٢ - **حافظ الحكمي** دەڵێ : ئەوانەی لاسایی ئەوکەسانە دەکەنەوە کە دەڵێن قورئان مخلوقە وە ڕێگری کراوە لەوەی نوێژیان لە پشتەوە بکرێت وە فەرمان کراوە سەریان ببڕن وە بە حەڕام کردنی میراتیان لەسەر موسڵمانان وەسەربڕاوەکانیان حەڕام کردوون لەبەر ئەوەی دەیان وت سەربڕاوی موڕتەدانە بۆ موسڵمانان حەڵاڵ نیە. معارج القبول(١/ ٢٨٠)



## (سەربڕاوی قەدەریەکان)

٣٣٣ - **ابن سيرين** سەربڕاوی قەدەریەکانی بە درووست نەزانیوە . شرح أصول إعتقاد لللالكائي (١٣٦٠)

٣٣٤ - **ابن هانئ** دەڵێ : سەربڕاوی ڕافیزە و قەدەرەیەکان ناخورێت وەک چۆن سەربڕاوی موڕتەد ناخورێت . مسائل ابن هانئ( ٢١٣)



## (سەربڕاوی ڕافزیەکان)

٣٣٥ - **طلحة بن مصرف** دەڵێ : ڕافیزیەکان ئافرەتەکانیان مارەناکرێت وە سەربڕاوەکانیان ناخورێت لەبەر ئەوەی مورتەدن. الإبانة الصغرى لابن بطة (١٦١)

٣٣٦ - **احمد بن یونس** دەڵێ : ئێمە سەربڕاوی پیاوێکی ڕافیزی ناخۆین چوونکە لای من مورتەدن .

شرح أصول إعتقاد للالكائي (٤٥٩)

٣٣٧ - **ابن هانئ** دەڵێ : سەربڕاوی ڕافیزە و قەدەرەیەکان ناخورێت وەک چۆن سەربڕاوی مورتەد ناخورێت . مسائل ابن هانئ (٢١٣)



## (سەربڕاوی ئەشعەریەکان)

٣٣٨ - **عمر بن ابراهيم** دەڵێ : سەربڕاوی ئەشعەریەکان حەڵاڵ نیە لەبەر ئەوەی موسڵمان نین وە ئەهلی کتاب ـیش نین پەرتووکی پەروەردگار لەسەر زەوی جێگیرناکەن. ذم الكلام للهروي(١٣١٨)

**لێدوانم** : ئەشعەریەکان کافرن بە الله تعالی بۆیە سەربڕاویان حەڵاڵ نیە وە ژنیشیان لێ مارە ناکرێت.

## (سەربڕاوی الدرزية و النصيرية ـەکان)

**الدرزية** : شوێن کەوتەی هشتکین الدرزي ـیە لە مەوالیەکانی حاکم بووە نێردرا بۆلای دۆڵی تمیم الله بن ثعلبة بانگەوازی ئیلاهیەتی حاکمی دەکرد وەناوی لێنرا (**الباري الغلام**) وە سوێندیان پێ دەخوارد ئەوان لە ئیسماعلیەکان بوون ئەوانەی دەیان وت : دینی محمد نسخ بۆتەوە ئینکاری و نکۆڵی ڕۆژی قیامەتیان دەکرد لەقەڕامیتەکان بوون لە یەهود و گاور و موشریکەکانی عەرەب کافرتربوون قسە و گوفتاریان مەجوسی بوو بەڵام زاهیریان شیعەبوون بە نیفاق.

**النصيرية** : شوێن کەوتەی أبي شعيب محمد بن نصير بوون لەو غولاتانە بوون دەیان وت : عەلی خوایە پەنا بە الله.

٣٣٩ - پرسیار لە **ابن تيمية** کرا حوکمی **الدرزية** و **النصيرية** چیە ؟ لە وەڵامدا وتی : ئەوانە کافرن بە ئیتیفاقی موسڵمانان سەربڕاوەکانیان حەڵاڵ نیە بۆتان وە ئافرەتانیان حلاڵ نیە ئەگەرچی شەعائیری ئیسلامیشیان بەدیارخستبێت ئەوە کافرن بە ئیجماعی موسڵمانان. المجموع الفتاوی (٣ /٥١٣)



## (سەربڕاوی خەواریجەکان)

٣٤٠ - **الخطابي** دەڵێ : ئیجماعی زانایانی موسڵمانان لەسەر ئەوەیە خەواریج لەگەڵ ئەو هەموو گومڕاییەی کە هەیانە گروپێکن لە موسڵمانان درووستە ژن مارەکرد و خواردنی سەربڕاوەکانیان وە تەکفیر ناکرێن مادەم دەستیان گرتووە بە ئەسڵی ئیسلام. معالم السنن (٣/ ٣٠٠)



## (باب)ـێکـ لە باسی ئەو ئاژەڵانەی کە دەخورێن و ئەوانەشی ناخورێن

سەرەتا پێش ئەوەی باس لە حەڵاڵی و حەڕامی  خواردنی ئەو ئاژەڵانە بکەین کە لە شەرعدا باسکراوە دەمەوێت چەند قاعیدەیەکـ لەسەر ئاژەڵ باس بکەم بۆ ئەوەی بتوانیت هەموو ئاژەڵێکی تر کە لێرە باس نەکراوە تۆ قیاسی سەر ئەم قاعیدانەی بکەیت و حەڵاڵ و حەڕام تێیاندا جیابکەیتەوە ئەوانیش:

## قاعیدەی یەکەم

**( الأصل في الحيوانات التي خلقها الله تعالى أنها مباحة الأكل)**

**ئەسڵ لەو ئاژەڵانەی کە الله تعالی درووستی کردوون خواردنیان ڕێگەیان پێدراوە**

**بەڵگەش بۆ ئەم قاعیدە:**

٣٤١ - **بەڵگەی یەکەم** : الله تعالی دەفەرمووێت (هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ) البَقَرَة : ٢٩

واتە : ئەو خوایە کە لە زەوییدا -لەبەر سوودو قازانجی ئێوە- هەموو جۆرە شتێکی دروستکرد .

**ڕووی بەڵگە** : الله تعالی منەت ئەکات بەسەر مرۆڤ کەهەرچی لەسەر زەوی درووستکراوە لە پێناو سوود و قازانجی ئێوەیە دیارە الله تعالیـ ش تەنها منەت بە حەڵاڵ دەکات بۆ مرۆڤ یەکێکیش لەو منەتانە بریتیە لە ئاژەڵەکان کە بۆ خواردن و سواربوون و کار پێکردنیان بۆ مرۆڤی موسەخەر کردووە.

٣٤٢ - **بەڵگەی دووهەم** : الله تعالی دەفەرمووێت (وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ وَإِنَّ كَثِيرًا لَيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُعْتَدِينَ) الأنعَام : ١١٩

واتە :دە بۆچی ئێوە لە گۆشتی ئەو پەلەوەرو ئاژەڵانە ناخۆن کە ناوی خوایان لەسەر دێ ؟ خۆ هەرشتێکی لێحەرامکردبن، بەباشی بۆی شیکردونەتەوە، واتە: بەتەواوی حەڵاڵ و حەرامی بۆ لێکجیاکردونەتەوە، دەسا ئێوەیش تخونی حەرامەکان مەکەون مەگەر شتێک لە ڕووی ناچارییەوە بێ، واتە: هەر چەندە ئەو پەلەوەرو ئاژەڵە نارەواو یاساغ بێ و ناوی خوای لێ نەهێنرابێ، لەکاتی ناچارییدا بۆتان رەواو حەڵاڵ دەبێ خواردنی خۆ زۆرێ لەو مەردمەش هەر بە ئارەزووی خۆیان و، بێ هیچ جۆرە زانست و زانیارییەک خەڵکێک سەر لێشیواو دەکەن، واتە: بەئارەزووی خۆیان حەڵاڵ حەرام دەکەن و، حەرام حەڵاڵ دەکەن ! بەڕاستی پەروەردگارت لەحاڵی خەڵکانی زێدە ڕۆو، سنوور بەزێن لە هەموو کەسێ بەئاگاو زاناترە.

٣٤٣ - **سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ** دەڵێ : (فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ) أي : وَكُلُوهُ فَإِنَّهُ حَلالٌ : بیخۆن ئەو ئاژەڵانەی ناوی ناوی الله ـیان لەسەر هێنراوە چوونکە حەڵاڵن . تفسير ابن أبي حاتم (٧٨١٣)

٣٤٤ - **سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ** دەڵێ : (وَمَا لَكُمْ أَلا تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ) يَعْنِي: الذبائح : سەربڕاوەکان

تفسير ابن أبي حاتم (٧٨١٦)

٣٤٥ - **قەتادە** دەڵێ : (وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ) يَعْني: بَيَّنَ لَكُمْ : لە ئاژەڵەکان حەڵاڵ و حەڕامی بۆ ڕوون کردوونەتەوە . تفسير ابن أبي حاتم (٧٨١٧)

٣٤٦ - **سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ** دەڵێ : (إِلا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ) يَعْنِي: مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ مِنَ الْمَيْتَةِ، فَهُوَ الاضْطِرَارُ كُلُّهُ : ئەوەی لەسەری حەڕام کردوون لە مردارەوەبوو ئەوە گشتی ناچاریە . تفسير ابن أبي حاتم (٧٨١٨)

٣٤٧ - **سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ** دەڵێ : (وَإِنَّ كَثِيرًا لَيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ) يَعْنِي مِنْ مُشْرِكِي الْعَرَبِ فِي أَمْرِ الذَّبَائِحِ : زۆرێک لە موشریکانی عەرەب گومڕا و جاهیل ـن بە باس و فیقهی سەربڕاوەکان بۆیە گومڕان بوونە بەهۆی هەوای بێ زانست . تفسير ابن أبي حاتم (٧٨١٩)

٣٤٨ - **مقاتل بن سليمان** دەڵێ : کافرەکانی شاری مەککە کاتێ بیستیان کە الله تعالی مردارەوەبووی حەڕام کردووە بە موسڵمانانیان دەوت : ئێوە وا گومان دەبەن بەدوای ڕەزامەندی پەروەردیگارەکەتان دەکەوین ؟ ئێوە دەتانەوێت ئەوەمان بۆ بگێڕنەوە کە ئەوەی بەدەستی ئێوە سەردەبڕدرێت چاکترە ؟ یان ئەوە چاکترە کە الله دەیکوژێت ؟ موسڵمانان پێیان وتن : بەڵکو الله تعالی چاکترین بکەرە پێیان وتن : دەبۆچی ئێوە ئەو ئاژەڵ و پەلەوەرانە دەخۆن کە بەدەستێ خۆتان سەریان دەبڕن کەچی ئەوە ناخۆن کە الله تعالی دەیکوژێت .

وە لای ئێوە مردارەوەبووە ؟ الله ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفرموویێت (وَما لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ ما حَرَّمَ عَلَيْكُمْ) واتە : الله بۆی ڕوون کردوونەتەوە کەچی ئاژەڵێک لەسەرتان

حەڕامە لە مردارەوەبوو و خوێن و گۆشتی بەراز لە پاشان استثناء دەکات و دەفەرموویت(إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ) لەوەی ڕێگری لێکردوون لە خواردنی (وَإِنَّ كَثِيراً) واتە : لە گەورەکانی قورەیش (لَيُضِلُّونَ) خەڵکی مەککەیان گومڕادەکرد (بِأَهْوائِهِمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ) لە فیقهی سەربڕین و سەربڕاوەکانیان.

تفسير مقاتل بن سليمان (١ / ٥٧٦)

٣٤٩ - **الطبري** دەڵێ : الله تعالى بۆ ئیمانداران ئەوەی حەڵاڵە پێش دەخات لەوەی ئەو گۆشتانەی ناوی پەروەردیگاری لەسەر هێنراوە وە حەڵاڵی خواردنی ئەو سەربڕاوەی کە لەسەر دینەکەی سەربڕدراوە یاخود لەسەر ئەو دینانەی کە لەسەر بەشێکی دینەکەی دەڕوات . وە حەڕامێتی ئەو ئاژەڵانەی بۆ غەیری الله تعالى سەردەبڕدرێن وە الله تەواوی بۆ ڕوون کردنەوە لەوەی کە کام ئاژەڵ حەڕامە و کامە حەڵاڵ.

تفسير الطبري (١٢ / ٦٩)

٣٥٠ - **بەڵگەی سێ یەم** : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویت (عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ، عَنْ أَبِيهِ ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : إِنَّ أَعْظَمَ الْمُسْلِمِينَ جُرْمًا مَنْ سَأَلَ عَنْ شَيْءٍ لَمْ يُحَرَّمْ، فَحُرِّمَ مِنْ أَجْلِ مَسْأَلَتِهِ)

واتە : لە موسڵمانان گەورەترین زوڵم تێیدا بکرێت ئەو کەسەیە کە پرسیار لە شتێک دەکات کە لەسەری حەڕام نیە حەڕام دەبێت لەبەر پرسیارەکە. مسند أحمد (١٥٤٥) سنن أبي داود (٤٦١٠)صحيح البخاري (٧٩٨٢) صحيح مسلم (٢٣٥٨)

**ڕووی بەڵگە** : شتەکان لە ئەسڵدا حەڕام نین تا دەلیلێک حەڕامی دەکات

❊❊❊

## قاعیدەی دووهەم

**(كل طيِّب من الحيوانات فهو حلال الأكل وكل خبيث فهو محرَّم الأكل)**

**هەموو پاکێک لە ئاژەڵان حەڵاڵە خواردنی وە هەموو پیسێک حەڕامە خواردنی**

**بەڵگەش بۆ ئەم قاعیدەیە:**

٣٥١ - (وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ) الأعراف : ١٥٧

واتە : هەمووشتێکی پاک و خاوێنیان، بۆ حەڵاڵ دەکا و هەموو شتێکی پیس و زیانبەخشیان لێ حەڕام دەکات، وەک شەراب و گۆشتی بەرازو ڕیبا...هتد

٣٥٢ - **سَعِيدِ بْنُ جُبَيْرٍ** دەڵێ : (الطَّيِّبَاتِ) يَعْنِي الذَّبَائِحَ الْحَلالَ طَيْبَةً لَهُمْ : واتە سەربڕاوی حەڵاڵ پاکە بۆتان. تفسير ابن أبي حاتم (٨٣٤٢)

٣٥٣ - **مُقَاتِلِ بْنِ حَيَّانَ** دەڵێ : (الطَّيِّبَاتِ) يَعْنِي فَالطَّيِّبَاتُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَهُمْ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ أَنْ يُصِيبُوهُ فَهُوَ حَلالٌ مِنَ الرِّزْقِ : پاک ئەوەیە کە الله تعالی بۆی حەڵاڵ کردوون لە هەموو شتێک کە بەدەستان دێ ئەوە حەڵاڵە لە ڕزق. تفسير ابن أبي حاتم (٨٣٤٣)

٣٥٤ - **ابْنِ عَبَّاسٍ** دەڵێ : (وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ) وَهُوَ لَحْمُ الْخِنْزِيرِ، وَالرِّبَا و مِنَ الْمَآكِلِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ : بریتیە لە گۆشتی بەراز وە ڕیبا وە ئەوانەش کە حەڕام کراوەکان حەڵاڵ دەکات لەو خواردنانەی کە الله حەڕامی کردووە . تفسير ابن أبي حاتم (٨٣٤٤)

**لێدوانم** : بەپێی سیفەتی ئاژەڵەکە لە خواردن و خواردنەوەکەی پیسی و پاکی بەدیار دەکەوێت.

## قاعیدەی سێ یەم

**(فليس كل ما استخبثه العرب من الحيوانات فهو حرام)**

**مەرج نیە هەموو ئەوانەی عەرەب بە پیسی دەزانێت لە ئاژەڵان حەڕام بێت**

٣٥٥ - **ابن تيمية** دەڵێ : مەبەست لە پاکـ ئەوەنیە کە کۆمەڵێکـ لە عەرەب لەززەتی لێ وەردەگرێت یان پاک ئەوە بێت کە تەنها عەرەب بۆی دەگەڕێتەوە ببێتە هۆکار کە بۆ ئێوەش پاک بێت یان ڕقیان لە خواردنێک ببێتەوە بەبیانووی ئەوەی لە وەڵاتانی ئەوان ناخورێت لە ئەنجامدا الله واجبی بکات بەسەر ئیمانداران کە حەڕام بێت خواردنی بە بیانووی ئەوەی لە تەبیعەتی عەرەب نزیک نیە یان شتێک واجبی بکات بەسەر ئیمانداران کە خواردنی حەڵاڵ بێت بەبیانووی ئەوەی عەرەب بۆی دەگەڕێتەوە لەخواردنی . چۆن ئەوە دەبێت لەکاتێکدا عەرەب مردارەوەبوو و خوێن دەخوات کەچی الله تعالی حەڕامی کردووە بەڵگەش ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم کە دەفەرمووێت:

٣٥٦ - **عَنْ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ قَالَ** : أُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِضَبٍّ مَشْوِيٍّ، فَأَهْوَى إِلَيْهِ لِيَأْكُلَ، فَقِيلَ لَهُ : إِنَّهُ ضَبٌّ. فَأَمْسَكَ يَدَهُ، فَقَالَ خَالِدٌ : أَحَرَامٌ هُوَ ؟ قَالَ : لَا، وَلَكِنَّهُ لَا يَكُونُ بِأَرْضِ قَوْمِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ فَأَكَلَ خَالِدٌ، وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْظُرُ.

**خالد بن وليد** دەڵێ : بزن مژەیەکی خشۆکیان بۆ پێغەمبەر هێنا صلى الله عليه وسلم ویستی دەست بەخواردنی بکات پێی وترا : ئەوە بزن مژەیە ئەویش دەستی هەڵگرت خالد پێی وت : ئەوە حەڕامە ؟ ئەویش فەرمووی : نا بەڵام لە زەوی قەومەکەم ناخورێت منیش بۆلای خۆم ڕام کێشا و خواردم پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم سەیری دەکرد

موطأ إمام مالك (٢٧٧٥) مسند أحمد (٣٠٦٧) سنن أبي داود (٣٧٩٤) سنن النسائي (٤٣١٦) سنن الدارمي (٢٠٦٠) صحيح البخاري (٥٥٣٧) صحيح مسلم (١٩٤٥)

٣٥٧ - **ابن تيمية** دەڵێ : لەم فەرموودەوە زانیمان کە ئەو ئاژەڵانەی یان هەر خواردنێک لە خواردنەکان کە قوڕەیش ڕقیان لێیە واجبی ناکات کە لەسەر گشت ئیمانداران و عەرەب حەڕام بێت بەهەمان شێوە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و هیچ یەکێک لە هاوەڵانیش شتێکیان حەڕام نەکردووە بەبیانووی ئەوەی عەرەب ڕقی لێبووە وە هیچ شتێکیان حەڵاڵ نەکردووە بەبیانووی ئەوەی عەرەب دەیخوات

مجموع الفتاوى (١٧/ ١٧٨)

❋❋❋

## قاعیدەی چوارەم

**(كل ذي ناب من السباع فهو محرم الأكل)**

**هەموو خاوەن کەڵبەیەکـ لە دڕندەکان  خواردنی حەڕامە**

**بەڵگەش بۆ ئەم قاعیدەیە:**

٣٥٨ - **عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ**، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ.

**أبي ثعلبة** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە لە خواردنی هەموو کەڵبەدارێکـ لە دڕندەکان.  مسند أحمد (١٧٧٤٠) سنن أبي داود (٣٨٠٢) سنن الدارمي (٢٠٢٣) سنن ابن ماجه (٣٢٣٢) سنن النسائي (٤٣٤٢) سنن الترمذي (١٤٧٧) صحيح البخاري (٥٧٨٠) صحيح مسلم (١٩٣٢)

٣٥٩ - **ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ** : نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ.

**ابن عباس** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە لە خواردنی هەموو کەڵبەدارێکـ لە دڕندەکان . سنن الدارمي (٢٠٢٥) سنن ابن ماجه (٣٢٣٤) سنن النسائي (٤٦٤٥) سنن أبي داود (٣٨٠٥) صحيح مسلم (١٩٣٤)

٣٦٠ - **أَبِي هُرَيْرَةَ** ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ :  أَكْلُ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ حَرَامٌ .

**أبي هريرة** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت : خواردنی هەموو خاوەن کەڵبەیەک لە دڕندەکان حەڕامە . موطأ إمام مالك (١٤٣٤) سنن ابن ماجه (٣٢٣٣) سنن الترمذي (١٧٩٥) صحيح مسلم (١٩٣٣)

٣٦١ - **خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ قَال** : أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ .

**خالد بن وليد** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە لە خواردنی هەموو کەڵبەدارێک لە دڕندەکان. سنن النسائي (٤٣٣٢) سنن أبي داود (٣٨٠٦)

٣٦٢ - **جَابِرٍ قَالَ** : حَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - يَعْنِي يَوْمَ خَيْبَرَ - ...كُلَّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ،

**جابر** دەڵێ : لە ڕۆژی جەنگی خەیبەردا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەموو خاوەن کەڵبەیەک لە دڕەندەکان حەڕامی کرد . سنن الترمذي (١٤٧٨)

٣٦٣ - **إمام أحمد** دەڵێ : هەموو شتێک بە ددان گاز بگرێت ئەوە لە دڕندەکانە . مسائل عبد اللَّه(١٠٠٨)

**لێدوانم** : هەموو خاوەن کەڵبەیەک خواردنی حەڕامە لێرە پرسیارێک دێتە پێش خۆ وشتر و مەڕ و مانگا و کەروێشک و دەیانی تر خاوەن کەڵبەن ئەی ئەوانەچی ؟ لە وەڵامدا دەڵێین : فەرموودەکە إستثناء ـی کردووە بە (السباع : دڕەندە) کە بە کەڵبەکەی نێچیر دەگرێت و گاز دەگرێت بۆ خواردنی گۆشتەکەی ئەوە حەڕامە .

وە **مسلم** لە "**صحيح**"ـەکەیدا باب ـێکی داناوە بەناوی (بَابُ : تَحْرِيمُ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَكُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ)



## قاعیدەی پێنجەم

**(كل ذي مخلب من الطير فهو محرم الأكل)**

**هەموو خاوەن چڕنۆکێک لە باڵندەکان خواردنی حەڕامە**

**بەڵگەش بۆ ئەم قاعیدەیە:**

٣٦٤ - **أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ الْعِرْبَاضِ قَالَتْ** : حَدَّثَنِي أَبِي ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَرَّمَ يَوْمَ خَيْبَرَ كُلَّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ.

**عرباض بن سارية** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە جەنگی خەیبەردا هەموو خاوەن چڕنۆکێکی لە باڵندە خواردنی حەڕام کرد.

مسند أحمد (١٧١٥٣) من حديث ابن عباس(٣٥٤٤) ومن حديث خالد بن الوليد(١٤٤٦٣) من حديث علي(١٢٥٤) سنن الدارمي من حديث ابن عباس(٢٠٢٥) سنن ابن ماجه من حديث ابن عباس(٣٢٣٤) سنن النسائي من حديث ابن عباس(٤٣٤٨) سنن الترمذي من حديث جابر(١٤٧٨) سنن أبي داود من حديث خالد بن الوليد(٣٨٠٦) صحيح مسلم من حديث ابن عباس(١٩٣٤)

**لێدوانم** : هەموو خاوەن چڕنۆکێک دەگرێتەوە کە نێچیر دەگرێت بەهۆی چڕنۆکەکانیەوە.



## قاعیدەی شەشەم

**(كل ما أمر النبي صلى الله عليه وسلم بقتله من الحيوانات أكله حرام)**

**هەموو ئاژەڵێک کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمانی کوشتنی کردووە خواردنی حەرامە.**

**بەڵگە و نمونە :**

٣٦٥ - **قَالَتْ حَفْصَةُ** : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ لَا حَرَجَ عَلَى مَنْ قَتَلَهُنَّ : الْغُرَابُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْعَقْرَبُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ.

**حفصة** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفرموویت : پێنج لە ئاژەڵان هەیە تاوانبار نابن لە کوشتنیان :

١ - الْغُرَابُ : قەڵە ڕەش لە ڕیوایەتەکی مسلم و ابن ماجه النسائي و احمد هاتووە : وَالْغُرَابُ الأَبْقَعُ : قەڵەڕەشێکی پشت یاخود سک سپی.

٢ - وَالْحِدَأَةُ : باڵندەیەکە لەهەر شوێنێک ئاگر هەبێت دەچێت بۆ بڵاوکردنەوەی ئاگرەکە.

٣ - وَالْفَأْرَةَ : مشک بە هەموو جۆرەکانیەوە.

٤ - وَالْعَقْرَبُ : دوو پشک .

٥ - وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ : سەگی بریندار کەر الأزهري لە کتێبی (المصباح)ـدا دەڵی : کلب العقور شێر و پڵنگ و گورگ دەگرێتەوە .

٦ - وَالسَّبُعُ الْعَادِي وە لە ڕیوایەتەکەی أبي داود هاتووە : هەر دڕندەیەکی دەست درێژکەر . ترمذي دەڵێ : ئەوەش وتەی سفیان الثوري و الشافعي ـیە وە الشافعي دەڵێ : هەر دڕندەیەکـ دەست درێژی کردە سەر خەڵکـ بیکوژن.

٧ - وَالذِّئْبِ : گورگـ ابن عمر دەڵێ : أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَتْلِ الْفَأْرَةِ وَالْغُرَابِ وَالذِّئْبِ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمانی کردووە بە کوشتنی مشک و قەڵەڕەش و گورگـ.

صحيح البخاري (١٨٢٨) ومن حديث عائشة(١٨٢٩) ومن حديث عبدالله بن عمر(٣٣١٥) صحيح مسلم من حديث عائشة(١١٩٨) ومن حديث عبدالله بن عمر(١١٩٩) ومن حديث حفصة(١٢٠٠) سنن أبي داود من حديث عبدالرحمن بن شبل(٨٦٢) ومن حديث ابن عمر(١٨٤٦) ومن حديث أبي سعيد الخدري(١٨٤٨) سنن الترمذي من حديث عائشة (٨٣٧) ومن حديث أبي سعيد الخدري(٦٣٨) سنن النسائي من حديث ابن عمر(٢٨٢٨) ومن حديث عائشة (٢٨٢٩) ومن حديث حفصة(٢٨٨٩) سنن ابن ماجه من حديث عائشة(٣٠٨٧) ومن حديث ابن عمر(٣٠٨٨) موطأ لإمام مالك من حديث ابن عمر(١٠٢٦) سنن الدارمي من حديث ابن عمر(١٨٥٧) ومن حديث عائشة(١٨٥٨) مسند احمد من حديث ابن عباس(٢٣٣٠) ومن حديث ابن عمر(٤٧٣٧)

❊❊❊

## قاعیدەی حەوتەم

**(كل حيوان نهى رسول الله عن قتله فهو حرام)**

**هەموو ئاژەڵێك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕێگری كرد لە كوشتنی حەڕامە خواردنی**

**بەڵگە و نمونە :**

٣٦٦ - **عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** ، قَالَ : نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ قَتْلِ النَّحْلَةِ، وَالنَّمْلَةِ، وَالصُّرَدِ، وَالْهُدْهُدِ.

**ابن عباس** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕێگری كردووە لە كوشتنی:

١ - النَّحْلَةِ : هەنگ

٢ - وَالنَّمْلَةِ : مێروله یان مێروستان

٣ - وَالصُّرَدِ : باڵندەیەكی جوانی دەنگ خۆشە

٤ - وَالْهُدْهُدِ : باڵندەی هود هود

٥- وَالضِّفْدَعِ :بـۆق ڕیوایەتی ابن ماجه فەرموودەی أبي هريرة.

مسند احمد من حديث ابن عباس(٣٢٤٢) سنن الدارمي (٢٠٤٢) سنن ابن ماجه(٣٢٢٤) ومن حديث أبي هريرة (٣٢٢٣) سنن أبي داود(٥٢٦٧)

٣٦٧ - **الخطابي** دەڵێ : هەموو ئاژەڵێك كە ڕێگری كراوە لە كوشتنی لەبەر دوو هۆكارە ئەوانیش : یان بەهۆی حەڕامەتی خودی خۆیەتی وەك مرۆڤ یان بەهۆی حەڕامێتی گۆشتەكەیەتی وەك باڵندەی هودهود و باڵندەی صرد كە باڵندەیەكی دەنگ خۆشی جوانە . معالم السنن (٤/ ٢٠٤)

## قاعیدەی هەشتەم

**(كل حيوان يعيش فى البحر فهو حلال الأكل حيا وميتا)**

**هەموو ئاژەڵێک لە دەریا بژیت ئەوە حەڵاڵە خواردنی زیندوو و مردووی.**

**بەڵگەش:**

٣٦٨ - الله تعالى دەفەرموویت ( أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَّكُمْ) المائدة : ٩٦

واتە : هەموو جۆرە نێچیرو خواردەمەنیەکی دەریاکانتان بۆ حەڵاڵە، ئیتر لە ئیحرامدابن، یان نا تا ببێتە بژێوی ئێوەو، رێبواران و، هەمووکاتێ کەڵکی لێوەرگرن.

٣٦٩ - پرسیار کرا لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەربارەی ئاوی دەریا لە وەڵامدا فەرمووی (هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحِلُّ مَيْتَتُهُ) واتە : ئاوەکەی پاکە و مرداربووەکانی حەڵاڵ.

مسند احمد من حديث أبي هريرة (٨٧٣٥) سنن الدارمي (٢٠٥٤) موطأ لإمام مالك (٤٥) سنن ابن ماجه (٣٢٤٦) سنن النسائي(٣٣٢) سنن الترمذي (٦٩) سنن أبي داود(٨٣)

٣٧٠ - **ئیمامی مالیک** دەڵێ : کێشە نیە بە خواردنی حوتێک کە مەجوسی ڕاوی کردووە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەربارەی دەریا دەفەرموویت : ئاوەکەی پاکە و مرداربووەکانی حەڵاڵ .

موطا (١٤٣١ - ١٤٣٢)

٣٧١ - **ئیمامی احمد** دەڵێ : پێم گەیشتووە أبي عبيدة الجواد دەڵێ : ئەم فەرموودەیە نیوەی زانستە لەبەرئەوەی دونیا پێک هاتووە لە دەریا و وشکانی دەربارەی دەریا فەتوا دراوە ئەوەی ماوەتەوە وشکانیە . سنن ابن ماجه (٣٢٤٦)

## قاعیدەی نۆیەم

**( أكل جميع الطيور الماء حلال)**

**خواردنی گشت باڵندەکانی دەریا حەڵاڵە.**

٣٧٢ - **ابن قدامة** دەڵێ : نەم زانیوە خیلافێک هەبێت لە حەڕامێتی باڵندە دەریایەکان بەڵام پێویستە سەر ببڕدرێن لەبەر ئەوەی لە دەریا و وشکانی دەژین. المغني (٩/ ٣٣٧)

❊❊❊

## قاعیدەی دەیەم

**(الحيوان الذي يأكل الجيف أكله حرام)**

**ئەو ئاژەڵەی کە تۆپیو دەخوات خواردنی حەڕامە.**

**بەڵگە و نمونە :**

٣٧٣ - **ابْنِ عُمَرَ قَالَ** : نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَكْلِ الْجَلَّالَةِ وَأَلْبَانِهَا.

**ابن عمر** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕێگری کرد لە خواردنی گۆشتی جلالة و شیرەکەی.

الْجَلَّالَةِ : ئەو ئاژەڵەیە کە پیسی دەخوات مەڕ و مانگا و وشتر و مریشک یەکسانن تێیدا **أَبُو دَاوُد** : الْجَلَّالَةُ : **الَّتِي تَأْكُلُ الْعَذِرَةَ** : بریتیە لەو ئاژەڵەی پیسی دەخوات .

٣٧٤ - **عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ** : نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْجَلَّالَةِ فِي الْإِبِلِ أَنْ يُرْكَبَ عَلَيْهَا .

**ابن عمر** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕێگری کردووە لەوەی سواری سەر پشتی ئەو وشترە ببین کە پیسی دەخوات.

سنن أبي داود (٣٧٨٦-٣٧٨٥-٣٧١٩-٢٥٢٨-٣٨١١-٣٧٨٧) سنن الترمذي (١٨٢٤-١٨٢٥) سنن النسائي(٤٤٤٧-٤٤٤٨) ابن ماجه(٣١٨٩) سنن الدارمي(٢٠٤٤) مسند احمد(٣١٤٩)

**لێدوانم** : هۆکارەکەی بریتیە لەوەی خواردنەکەی پیسە واتە پیسخۆرە بۆیە هەر ئاژەڵێک پیسخۆربێ گۆشتەکەی خواردنی حەڕامە.

## قاعیدەی یازدەهەم

**(كل الحشرات أكلها حرام)**

**هەموو حەشەڕاتێک خواردنی حەڕامە**

❋❋❋

## قاعیدەی دوازدەهەم

**(كل ما تولد من الحيوانات بين مأكول و غير مأكول أكلها حرام)**

**هەموو لەدایک بووەک لە ئاژەڵان لەنێوان ئاژەڵێکی حەڵاڵ و حەڕام بێت خواردنی حەڕامە .**

**نمونە :** هێستر کە لە نێوان گوێدرێژی ماڵی(خواردنی حەڕامە) و ئەسپ (حڵاڵ) لەدایک بووە خواردنی حەڕامە.

لێرە چەند ئاژەڵێک باس دەکەین لەوەی کە درووستە بخورێن و سەریان ببردرێت ئەوانی تر خۆتان بیخەنە تەرازووی ئەم کۆمەڵە عاقیدەی سەرەوە کە باسکران ئاوا ئاسانتر حەڵاڵ و حەڕام لەیەک جیا دەکەنەوە:

**(وشتر و مەڕ و بزن و مانگا)**

خواردنیان درووست و حەڵاڵن بەڵگەش :

٣٧٥ - الله تعالی دەفەرمووێت(أُحِلَّتْ لَكُمْ بَهِيمَةُ الْأَنْعَامِ) المَائدة :واتە :خواردنی گۆشتی وشترو گاو مەڕو بزن -دوای سەربڕینیان- حەڵاڵکراوە بۆتان، هەروەها بەچکەی هەرکامێکیشیان، ئەر دوای سەربڕینی لەناو سکیا گیانی تێدا نەمابێ، وەکو پێغەمبەر دەفەرموێ: (كُلُوهُ إنْ شِئْتُمْ، فإن ذكاتَهُ ذَكَاةُ أُمّهِ)

سنن أبي داوود(٢٤٥٩)

**(ئەسپ)**

خواردنی درووست و حەڵاڵە بەڵگەش فەرموودەی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم:

٣٧٦ - **عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، قَالَ : نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ، وَرَخَّصَ فِي لُحُومِ الْخَيْلِ.

**جابر** دەڵێ : پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە جەنگی خەیبەردا نەهی کرد لە خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی وە ڕوخسەتی خواردنی گۆشتی ئەسپی دا.

٣٧٧ - لە "**سنن النسائي**"دا هاتووە **جابر** دەڵێ : ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم ئەسپمان سەردەبڕی و دەخوارد.

صحيح البخاري(٥٥٢٠) صحيح مسلم(١٩٤١) سنن أبي داود(٣٧٨٨) سنن الترمذي(١٧٩٣) سنن النسائي(٤٣٢٨) سنن ابن ماجه(٣١٩٧) سنن الدارمي(٢٠٣٦) مسند احمد(١٤٨٩٠)

**لێدوانـم** : ئیمامی النسائي لە "**سنن**"ـەکەیدا باب ـێکی داناوە بەناوی (تَحْرِيمُ أَكْلِ لُحُومِ الْخَيْلِ) وە ئەم فەرموودەی لەژێر داناوە :

٣٧٨ - **عَنْ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ** ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ : لَا يَحِلُّ أَكْلُ لُحُومِ الْخَيْلِ وَالْبِغَالِ وَالْحَمِيرِ . سنن النسائي (٤٣٣١) سنن ابن ماجه(٣١٩٨) مسند احمد(١٦٨١٧) سنن أبي داود(٣٧٩٠)

٣٧٩ - **ابي داود** دەڵێ : وَهَذَا مَنْسُوخٌ ؛ قَدْ أَكَلَ لُحُومَ الْخَيْلِ جَمَاعَةٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مِنْهُمُ ابْنُ الزُّبَيْرِ، وَفَضَالَةُ بْنُ عُبَيْدٍ، وَأَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، وَأَسْمَاءُ بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ، وَسُوَيْدُ بْنُ غَفَلَةَ، وَعَلْقَمَةُ، وَكَانَتْ قُرَيْشٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَذْبَحُهَا.

واتە : ئەو فەرموودەیەی خالد بن الولید نەسخ کراوەتەوە بەو فەرموودانەی ڕێگەی پێدراوە بخورێت جەماعەتێک لە هاوەڵان گۆشتی ئەسپیان خواردووە لەوانە ابْنُ الزُّبَيْرِ، وَفَضَالَةُ بْنُ عُبَيْدٍ، وَأَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، وَأَسْمَاءُ بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ، وَسُوَيْدُ بْنُ غَفَلَةَ، وَعَلْقَمَةُ وە قورەیش لەسەردەمی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم سەریان دەبڕی.



## باب ـێکـ لە صحيح البخاري بۆ ئەو ئاژەڵانەی پێشوو

٣٨٠ - **بَابٌ** : إِذَا صَادَ الْحَلَالُ فَأَهْدَى لِلْمُحْرِمِ الصَّيْدَ أَكَلَهُ. وَلَمْ يَرَ ابْنُ عَبَّاسٍ وَأَنَسٌ بِالذَّبْحِ بَأْسًا، وَهُوَ غَيْرُ الصَّيْدِ، نَحْوُ الْإِبِلِ، وَالْغَنَمِ، وَالْبَقَرِ، وَالدَّجَاجِ، وَالْخَيْلِ، سنن أبي داود (٣٧٩٠)

**(مریشکـ)**

خواردنی درووست و حەڵاڵە بەلگەش:

٣٨١ - ترمذي باب ـێکی داناوە بەناوی (**بَابُ : مَا جَاءَ فِي أَكْلِ الدَّجَاجِ**) وە النسائي باب ـێکی داناوە بەناوی (**بَابُ : إِبَاحَةُ أَكْلِ لُحُومِ الدَّجَاجِ**) وە الدارمي باب ـێکی داناوە بەناوی (**بَابٌ : فِي أَكْلِ الدَّجَاجِ**.) وە ئەم ئەثەرەی لەژێر ئەم باب ـەوە داناوە:

٣٨٢ - عَنْ أَبِي مُوسَى ، أَنَّهُ ذَكَرَ الدَّجَاجَ فَقَالَ : رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْكُلُهُ.

**أبي موسى** دەڵێ : پێغەمبەرم بینی صلی الله علیه وسلم مریشکی دەخوارد

سنن الدارمي (٢١٠٠)

**(زەڕافە)**

خواردنی درووست و حەڵاڵە چوونکە پاکە و گیا خۆرە بەڵگەش:

٣٨٣ - پرسیار لە **ئیمام احمد** کرا ئایە زەڕافە دەخورێت ؟ وتی : بەڵێ . المغني (١٣ /٣٢٤)

**(چۆڵەکە)**

خواردنی درووست و حەڵاڵە بەڵگەش:

٣٨٤ - **عَبْدَ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو**، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَخْبَرَهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا مِنْ إِنْسَانٍ يَقْتُلُ عُصْفُورًا فَمَا فَوْقَهَا بِغَيْرِ حَقِّهَا إِلَّا سَأَلَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَنْهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ» قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا حَقُّهَا؟ قَالَ: «حَقُّهَا أَنْ يَذْبَحَهَا فَيَأْكُلَهَا وَلَا يَقْطَعَ رَأْسَهَا فَيَرْمِيَ بِهِ.

**عبدالله بن عمرو** دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویت : هەر مرۆڤێک چۆڵەکەیەک ئەوەشی لە سەرووی ئەوە بەناحەق بکوژێت ئیللا الله تعالى لە قیامەت پرسیاری لەسەر دەکات وترا : ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەی حەقی چیە ؟ فەرمووی : حەقەکەی بریتیە لەوەی سەری ببڕیت و بیخۆیت نەک سەری ببڕیت و فڕێی بدەیت. المستدرك للحاكم (٧٥٧٤)

**(کەروێشک)**

خواردنی درووست و حەڵاڵە بەڵگەش:

٣٨٥ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ : أَنْفَجْنَا أَرْنَبًا بِمَرِّ الظَّهْرَانِ، فَسَعَوْا عَلَيْهَا حَتَّى لَغِبُوا ، فَسَعَيْتُ عَلَيْهَا حَتَّى أَخَذْتُهَا، فَجِئْتُ بِهَا إِلَى أَبِي طَلْحَةَ، فَبَعَثَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِوَرِكِهَا وَفَخِذَيْهَا فَقَبِلَهُ.

**انس** دەڵێ : کەروێشکێک لە مر الظهران (دۆڵێکە ٥ میل لە مککەوە دوورە) دەرچوو خەڵکەکەش بەدوای کەوتن و گرتیان هێنایان بۆلای أبا طلحة ئەویش سەری بڕی و ڕانەکەی بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نارد ئەویش قەبوڵی کرد و خواردی.

صحيح البخاري(٥٤٨٩) صحيح مسلم(١٩٥٣) سنن أبي داود(٣٧٩١) سنن الترمذي بزيادة :جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، أَنَّ رَجُلًا مِنْ قَوْمِهِ صَادَ أَرْنَبًا أَوْ ثِنْتَيْنِ، فَذَبَحَهُمَا بِمَرْوَةٍ فَتَعَلَّقَهُمَا حَتَّى لَقِيَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَسَأَلَهُ فَأَمَرَهُ بِأَكْلِهِم(١٤٧٢) سنن النسائي (٤٣١٢) سنن ابن ماجه(٣٢٤٣) سنن الدارمي(٢٠٥٦) مسند احمد(١٢١٨٢)

٣٨٦ - **کیسان** دەڵێ : هیچ کێشەیەک لە خواردنی کەروێشکدا نیە . المصنف لعبدالرزاق (٨٦٩٥)

٣٨٧ - **عُبَيْدِ بْنِ سَعْد** دەڵێ : بیلال بە کۆچانەکەی لە کەروێشکێکی دا قاچەکانی شکاند دواتر سەری بڕی و خواردی . **المصنف لعبدالرزاق (٨٦٩٦)**

٣٨٨ - **ابْنِ عَبَّاسٍ** دەڵێ : پرسیارم لە عائیشە کرد ئایە پێغەمبەرت بینیوە صلی الله علیه وسلم کە کەروێشک بخوات ؟ عائیشە وتی : نەم بینیوە بیخوات جگە لەوە نەبێت بە دیاری بۆمان هات من نوستبووم کاتێ هەستام پێی دام منیش خواردم . المصنف لعبدالرزاق (٨٦٩٨)

٣٨٩ - **جَرِيرُ بْنُ أَوْسٍ الْأَسْلَمِيُّ** دەڵێ : پرسیارم لە پێغەمبەرکرد صلی الله علیه وسلم دەربارەی خواردنی گۆشتی کەروێشک ؟ فەرمووی : نایخۆم چوونکە هەواڵم لێی هەیە تووشی حەیز دەبن.

المصنف لعبدالرزاق (٨٦٩٩)

**لێدوانم** : سەیری ڕیوایەتەکەی عائشە بکە وتی : نەم بینیوە بیخوات جگە لەوە نەبێت بە دیاری بۆمان هات من نوستبووم کاتێ هەستام پێی دام منیش خواردم ...هۆکاری نەخواردنی ئەوەبووە تووشی حەیز دەبن دڵی نەی بردووە بەڵام داویەتی بە عائشە واتە خواردنی حەڕام نیە ئەوەش تەبیعەتە.

**(کەمتیار)**

خواردنی درووست و حەڵاڵە بەڵگەش:

٣٩٠ - عَنِ ابْنِ أَبِي عَمَّارٍ ، قَالَ : قُلْتُ لِجَابِرٍ : الضَّبُعُ، أَصَيْدٌ هِيَ ؟ قَالَ : نَعَمْ. قَالَ : قُلْتُ : آكُلُهَا ؟ قَالَ : نَعَمْ. قَالَ : قُلْتُ : أَقَالَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ قَالَ : نَعَمْ.

**ابن أبي عمار** دەڵێ : وتم بە جابر ئایە کەمتیار ڕاو دەکرێت ؟ وتی : بەڵێ وتم : دەخورێت ؟ وتی : بەڵێ وتم : پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی ؟ وتی : بەڵێ .

سنن الترمذي (٨٥١) سنن النسائي(٢٨٣٦) مسند احمد(١٤٤٢٥)

**الترمذي** دەڵێ : ئەم فەرموودەیە حسن صحیح ـە هیچ کێشەیەک لە خواردنی کەمتیار لای ئەهلی علم نەبینراوە ئەوەش وتەی امام احمد و اسحاق بن راهویە ـیە ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم لەوەی کە خواردنی کەمتیار کەڕاهیەتی تێدابێت ئەوەش وتەی ابن المبارکـە بەڵام فەرموودەکان بەهێز نین ئەم فەرموودانەی دەربارەی خواردنی کەمتیار هاتوون بەهێزترن. سنن الترمذي(١٧٩١)

٣٩١ - **نافع** دەڵێ : وترا بە ابن عمر سعد بن وقاص کەمتیار دەخوات هیچ ئینکاریەکی لێ نەکرد

المصنف لابن أبي شيبة(٢٥٨٧١)المصنف لعبدالرزاق (٨٦٨٣)

٣٩٢ - **عطاء** دەڵێ : هیچ کێشەیەک لە خواردنی کەمتیاردا نیە ئەویش نیچیرە. المصنف لابن أبي شيبة(٢٥٨٧٢)

٣٩٣ - **عبد اللَّه بن زيد** ددەڵێ : پرسیارکرا لە أبا هريرة دەربارەی کەمتیار وتی : مێینەیەکە لە مەر و ماڵات. المصنف لابن أبي شيبة(٢٥٨٧٣)

٣٩٤ - **جابر** دەڵێ : کەمتیار لام خۆشەویسترە لە بەرانێک . المصنف لابن أبي شيبة(٢٥٨٧٤)

٣٩٥ - **هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ** دەڵێ : باوکم وتی عەرەب بەردەوام کەمتیاریان دەخوارد .

المصنف لابن أبي شيبة(٢٥٨٧٥)المصنف لعبدالرزاق (٨٦٨٦)

٣٩٦ - **أبي سعيد** دەڵێ : هەریەک لە ئێمە ئەگەر کەمتیاری بەدیاری پێ بدرابا لامان خۆشەویستربوو لە مریشکێکی قەڵەو. المصنف لابن أبي شيبة(٢٥٨٧٦)

٣٩٧ - **عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدٍ** دەڵێ : پرسیارم لە عبدالله بن جابر کرد دەربارەی کەمتیار ؟ جابر وتی : حەڵاڵە منیش پێم وت : لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم ؟ وتی : بەڵێ. المصنف لعبدالرزاق (٨٦٨١)

٣٩٨ - **مُجَاهِد** دەڵێ : ئیمامی عەلی هیچ کێشەیەکی نەدەبینی لە خواردنی کەمتیار وە بە نێچیر حیسابی دەکرد. المصنف لعبدالرزاق (٨٦٨٤)

٣٩٩ - **عَمْرِو بْنِ مُسْلِمٍ** دەڵێ : پرسیار لە عکرمة کرا دەربارەی کەمتیار ؟ وتی : لەسەر سفرەی ابن عباس بینیم. المصنف لعبدالرزاق (٨٦٨٥)

**لێدوانم** : تەنها سعید بن المسیب نکۆڵی لێدەکرد وە پرسیارێک دێتە پێش پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە لە خواردنی گۆشتی هەموو خاوەن کەڵبەیەک خۆ کەمتیاریش خاوەن کەڵبە ؟ لە وەڵامدا دەڵێین : ئەو فەرموودانە بە عموم هەموو خاوەن کەڵبەیەک خواردنی گۆشتی حەرامە تەنها کەمتیار نەبێت فەرموودەکەی جابر ئەم عموم ـەی تخصیص کردووە ک لەسەرەوە داماناوە.

**(یربوع)**

**الیربوع** : لە جۆری مشک ـە خاوەنی دوو گوێی درێژ و دوو دەستی کورت و دوو قاچی درێژ و چاوێکی زەق لە ڕووی شێوە بە کەنغەر دەچێت و لە قەبارەش وەک مشک خواردنی گۆشتی درووست و حەڵاڵە بەڵگەش:

٤٠٠ - **معمر** دەڵێ : پرسیارم لە عطاء الخراساني کرد دەربارەی خواردنی یەربوع ؟ وتی : هیچ شتێکم پێ نەگەیشتووە وە بە حەرامێ نازانم . المصنف لعبدالرزاق (٨٦٩٠)

٤٠١ - **مالك بن دينار** دەڵێ : خواردنی یربوع هیچ کێشەیەکی تێدانیە. المصنف لعبدالرزاق (٨٦٩٠)

٤٠٢ - **طاووس** دەڵێ : پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی خواردنی گۆشتی یربوع ؟ لە وەڵامدا وتی : هیچ کێشەیەکی تێدانیە . المصنف لعبدالرزاق (٨٦٩١)

٤٠٣ - **عبدالله بن الإمام أحمد** دەڵێ : پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی خواردنی گۆشتی یەربوع ؟ لە وەڵامدا وتی : نازانم چیە ئەوە . مسائل عبد اللّٰه (١٠٠٩)

**(ڕێوی)**

خواردنی گۆشتی ڕێوی درووستە

٤٠٤ - **طاووس بن كيسان** دەڵێ : هیچ کێشەیەک لەخواردنی گۆشتی ڕێوی نابینم. المصنف لعبدالرزاق (٨٧٤٢)

٤٠٥ - **قتادة** دەڵێ : ڕێوی لە دڕندەکان نیە وە خواردنی هیچ کێشەیەکی تێدانیە . المصنف لعبدالرزاق (٨٧٤٣)

٤٠٦ - **ابْنِ جُرَيْج** دەڵێ : پرسیارم لە عطاء کرد دەربارەی خواردنی کەمتیار و ڕێوی ؟ لە وەڵامدا وتی : بیانخۆن لەپێناو ئەوەی ئازار دەدرێن هەر نێچیرێک ئازار بدرێت ئەوە دەبێتە نێچیر . المصنف لعبدالرزاق (٨٧٤٤)

**(الوبر)**

**الوبر** : ئاژەڵێکە لە جورج گەورەترە لە سەحرا دەژیت خواردنی گۆشتی حەڵاڵە.

٤٠٧ - **ابن عبدالبر** دەڵێ : لای من وەک کەروێشکە هیچ کێشەیەک لە خواردنیدا نیە لەبەر ئەوەی باقلەمەنی و گژ و گیا و سەوزەوات دەخوات . التمهيد (١/ ١٥٦)

**(نەعامە)**

خواردنی گۆشتی درووست و حەڵاڵە

٤٠٨ - **ابن قدامة** دەڵێ : نەعامە حەڵاڵە خواردنی ئیجماعی لەسەرە وە هیچ خیلافێک لە خواردنی گۆشتی دا نیە . المغني (٩ /٣٢٧)

**ئەوانەش خواردنی گۆشتیان حەڵاڵە:**

٤٠٩ - **بەبەغا**

٤١٠ - **مراوی**

٤١١ - **بەتریق**

٤١٢ - **بولبول** بە هەموو جۆرەکانیەوە

٤١٣ - **حوباری** : جۆرێکە لە باڵندە بە طاووس دەچێت

٤١٤ - **کۆتر** بە کۆتری وشکانی و دەریای

٤١٥ - **قەتێ** : جۆرێکە لە باڵندە

٤١٦ - **مریشکە ڕەشەی کێوی**

٤١٧ - باڵندەی **کەو**

٤١٨ - **مامز** بەهەموو جۆرەکانیەوە.

٤١٩ - **کولـلە** : دەیان ئەثەر و فەرموودەی لەسەرە.

٤٢٠ - **باڵندەی تاووس**

٤٢١ - **باڵندەی ماسی گر**

٤٢٢ - **ژوژک**

٤٢٣ - **کەنغەر**

٤٢٤ - **نێری کێوی**

٤٢٥ - **باڵندەی کوختی** : بە ئیجماع خواردنی حەڵاڵ

٤٢٦ - **ماسی** بەهەموو جۆرەکانیەوە

٤٢٧ - **بزن مژە**

وصل اللهم على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه وسلم

تم بحمد الله

**هاوکار کوردی**

ئەسینا - یۆنان

# پێرست

